نوسینی: سەعید گوڵ محمدی
وەرگێڕانی : جەبار تەنیا



# لە کورتی تۆیە
# دیوار بڵندە

It is your shortness
That makes
The wall look like!

# لەکورتی تۆیە
# دیوار بڵندو

نوسینی: سەعید گوڵ محەمەدی
و. لە فارسیەوە: جەبار تەنیا

چاپی یەکەم

٢٠١٨

**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب: لەکورتی تۆیە دیوار بڵندە

بابەت: گەشەپێدانی مرۆیی

نووسینی: سەعید گوڵ محەمەدی

وەرگێڕانی بۆ کوردی:جەبار تەنیا

دیزاینی بەرگ: ئیبراهیم ساڵح

چاپخانە: چوارچرا

ژمارەی دانە: ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١٨

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی (١٧٢٩ ) ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە

کەس دیار نیە وەرە با ژیان بدزین.
ئەو کاتە لە نێوانی دوو دیداردا بەشی بکەین،
وەرە با شتێك لە بەردەوە فێر بین،
وەرە زووتر شتەکان ببینین.
"سوهراب سپێهری"

فەیلەسوفی یۆنانی بەم پرسیارە کۆتایی بە لێدوانەکەی هێنا: "ئایا کەس پرسیاری هەیە؟"

"رۆبیرت فولگام" نوسەری ناودار لە نێوان ئامادەبواندا وتی: "بەڕێز جەنابی دکتۆر بابادرۆس... مانای ژیان چیە؟"

هەموو ئامادەبوان پێکەنین. بابا درۆس هەموو خەڵکەکەی بێدەنگ کرد، پاشان کیفەکەی باخەڵی دەرهێناو ناو کیفەکە گەڕاو ئاوێنەیەکی خڕی بچوکی تێدا دەرکرد، وتی: "ئەو دەمەی منداڵ بووم سەردەمی شەڕ بوو، ئێمە گەلێ هەژار بوین، لەگوندێکی دوورە دەستدا دەژیاین. ڕۆژێك لە قەراخی جادەیەك چەند پارچە ئاوێنەیەکی شکاووم لە لاشەی ماتۆڕێکی ئەڵمانیدا دیتەوە. گەورەترین پارچەم هەڵگرتەوەو بە خشاندنی بە بەردێکی زبردا، خڕم کردەوە، هەر ئەم ئاوێنەیەی بەدەستمەوەیە

دەیبینن، پاشان وەك شتێكی یاریكردن دەستمكرد بە یاری پێكردنی، پێچەوانە كردنەوەی تیشكی خۆر بۆ هەر كونو قوژبن درزو كەلێنو تاریكترین ئەو شوێنانەی كە تیشكی خۆریان پێ نەدەگەیشت. بە كۆمەكی ئەم ئاوێنەیە دەمتوانی تاریكترین خاڵی دنیا ڕوناك بكەمەوە، هێندە خولیاو شەیدای بووم كە هەر لەباسكردن نایەت.

لە ڕاستیدا، گەیاندنی تیشك بۆ تاریكترین شوێنی دەوروبەرم، یارییەكی ڕۆژانەم بوو. ئاوێنەكەم هەڵگرت لەسەردەمانی دواتری ژیانمدا هەركاتێك بێكار دەبووم لەباخەڵم دەرمدەكردو یاریە هەمیشەییەكەی خۆمم پێدەكرد. كە گەورە بووم زانیم ئەم كارەم یارییەكی منداڵانە نەبوو، بەڵكو كاردانەوەی ئەو كارانە بوو كە ئەگەریان هەبوو بتوانم لە ژیانمدا ئەنجامیان بدەم. دواتر زانیم كە من، خودی ڕوناكی یان سەرچاوەی سەرەكی نیم، بەڵكو ڕوناكیو ڕوونتر، هەقیقەت هەست و دانایی لە جێیەكی دیكەیە، تەنها لە حاڵێكدا تاریكترین شوێنی دنیا ڕوناك دەكاتەوە كە من ڕەنگی پێ بدەمەوە.

من پارچەیەك لەو ئاوێنەیەم لە شەقڵو شێوەی ڕاستەقینەی زانیاریەكی ئەوتۆم نیە. وێڕای ئەمە، هەرچیەك بم، دەتوانم ڕوناكی بۆ تاریكترین شوێنی دنیا، ڕەشترین خاڵو شوێنی دڵی مرۆڤەكان پێچەوانە بكەمەوەو هۆكاری گۆڕینی هەندێ لە شتەكان لە هەندێ كەسدا بكەم. ڕەنگە كەسانیتریش ئەم كارە بكەن، بە تەواوی ئەمە هەمان ئەو شتەیە من بەدوایدا دەگەڕێم. ئەمە مانای ژیانی منە."

دوای تەواوبونی وانەكە، دوبارە ئاوێنەكەی بەدیقەتەوە گرتەوە بە

دەستیەوە. بە کۆمەکی ئەو ستونەی روناکی خۆرەکە کە لە پەنجەرەکەوە دەهاتە نێو هۆڵەکەوە، تیشکەکەی بەر ڕوخسارو دەستەکانم کەوتو بریسکەی دایەوە.

ئەو شوێنەی تاریکو ئەنگوستە چاوە با ڕوناکی بۆ ببەین،

ئەو شوێنەی هیوای لێ نیە، هیوا.

لە نوری خوداییدا هەنگاو هەڵگرین.

ئەم بەرهەمەی لەبەردەستی ئێوەدایە، کۆمەڵێك چیرۆکو رستەو شیعری ئیلهام بەخشە کە نوسەر بە درێژایی ساڵانێك لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەدنیای جوانو سەرسوڕهێنەری سەرکەوتندا ئاشنایان بووە، بە هۆی گرانبەهاییو نایابیانەوە کۆی کردونەتەوە.

**بیرو خەیاڵو ئەو سەرکەوتنانەی لەگەڵ زۆربەتاندا هەماهەنگە، خۆتان دروستان کردوون، جا ئەرێنی بێت یان نەرێنی.**

**"برایان تریسی"**

## مەلای مەشهورو هێستری چەموش

مەلای مەشهور هێسترێکی چەموش‌و نائارامی هەبوو، رۆژێك هێندە نارەحەتی کرد، هەوسارەکەی گرت‌و بردیە بازاڕ بۆ فرۆشتن. لە ڕێگا هەر دۆست‌و ناسراوێکی دەبینی، دەستی دەکرد بە گلەیی‌و سکاڵاکردن لە دەست هێسترەکەی.

یەکێك لە ناسراوەکانی پێی وت: "بە پێی ئەم گلەیی‌و گازندەیەی تۆ، من ئەقڵم نایبڕێت بۆ ئەم هێسترە جوتە وەشێنە موشتەریەك هەبێت."

مەلا وتی: "خۆ ئەگەر نەتوانم بیفرۆشم، لانیکەم خەڵکی دەزانن من دەردەسەریەك بەدەستیەوە دەچێژم!"

خالی سەرنج:

یاسای کێشکردن دەڵێت دەبێت لەسەر ئەو شتەی دەمانەوێ چڕ ببینەوە، نەك ئەوەی نامانەوێ.

بە ڕواڵەت ئەم ڕێسایە ئاسانە، بەلام کار پێکردنی گرانە. بۆچی؟ چونکە

نازانین چ کاتێك لەحاڵەتی تەرکیز کردنو چڕ بوونەوەی ئەو شتانەین کە نامانەوێ:

- کاتێ لەحاڵەتی گلەیی کردنداین لەبارو دۆخی ناهەموار، لەراستیدا خەریکین چڕ دەبینەوە لەسەر ئەوەی نامانەوێ.
- کاتێ ڕەخنە لە ڕەفتاری نەخوازراوی کەسێك دەگرین، لەراستیدا لەحاڵەتی چڕبوونەوەی ئەو شتەداین کە نامانەوێ.
- کاتێ زمان بە گلەیی دەکەینەوە، ئەوەی نامانەوێ گەردونی لێ ئاگادار دەکەینەوە.
- کاتێ دەردە دڵ بۆ کەسێك دەکەین، لەحاڵەتی ناردنی لەرینەوەی نەرێنیداین بۆ گەردون، چونکە نەخوازراوەکانمان دەژمێرن.

هەر جۆرە سکاڵاو گلەیی‌و ڕەخنەیەك واتا چڕبوونەوە لەسەر ئەو شتەی نامانەوێ، واتا کێشکردنی نەخوازراوەکان.

لەئەمڕۆوە بڕیار بدەن، لە گلەیی‌و ڕەخنە گرتن دەست بکێشنەوە، بەمجۆرە لە بۆڵەو سکاڵاکردن لە گفتوگۆی ڕۆژانەتان لە هەڵسوکەوتتان لەگەڵ خەڵکی کەمتر دەبێتەوە. ئەم یاسای گەردونە، گۆڕان لەدەرونی خۆتاندا، دنیای دەرەوەتان بۆ دەگۆڕێت.

مەولانا دەڵێت: گەر تینوەکان بە دوای ئاودا دەگەڕێن لە دنیادا، ئاویش بەدوای ئەواندا دەگەڕێت لە دنیادا.

جاك کانفیڵد دەڵێت: ئەگەر ئەو شتەی لێی دەترسیت، یان پەسەندی ناکەیت خۆت ئامادە بکەیت، هەمان ئەو شتە بۆ خۆت کێش دەکەیت!

بەهەشتو دۆزەخ لەناخی تۆدایە
بۆچی لەدەرەوەی خۆت بۆی دەگەڕێی
ئەی دۆست.

"پوریا وەلی"

دیدگا

پیرەمێردێکی نابینا، چونکە هاوسەرەکەی مردبوو، چارەیەکی نەبوو بێجگە لەوەی بچێتە خانەی پیرانەوە، ماوەیەکی زۆر لە خانەی پیراندا چاوەڕوانی کردو سەرەنجام پێیان وت ژورەکەی ئامادەیە، ئەو کەسەی لە ڕاڕەوەکەدا هاوکاری دەکرد، لە بارەی چۆنێتی ژورەکەیەوە قسەی بۆ دەکرد.

پیرەمێرد وتی: "گرنگ نیە، بەختەوەری شتێکە پێشتر پلانی بۆ دادەنێین. لەوەی چەندە ژوورکەم پێخۆشەو چەندەم خۆشدەوێ، پەیوەست نیە بەوەی کەلوپەلەکانی چۆن ڕێکخراوون. گرنگ ئەمەیە کە من زەینی خۆم چۆن ڕێك دەخەم!"

جاك کانفێلد دەڵێت: ئێوە دەتوانن دیدگای خۆتان بگۆڕن، سەرەنجام، ژیانی خۆتان.

ئەو ڕاستیەی دێتە بەرچاومان، هێندەی دیدگای خۆمان گرنگ نیە، چونکە تەنها دیدگای خۆمانە شکستو ناکامی خۆمان دیاری دەکات.

"نورمن وینست پیل"

**کاتێ هێزی عەشق، بە هێزەوە**

**بەسەر عەشقدا زاڵ دەبێت**

**دنیا تامی ئاشتی دەچێژێت.**

**"جیمی هند ریکس"**

## کوروشی گەورە

دەڵێن ئەو دەمەی کوروش گەیشتە پلەی سەڵتەنەت، دەوڵەتی یۆنـان جەنگی لەدژی ئەو بەرپا کرد. کوروش داوای لـە یۆنانیـەکان کـرد دەسـت لەجەنگ بکێشـنەوە، بـەڵام بـەردەوام دەوڵـەتی یۆنـان پێـداگری دەکـردو ئاشـتەوایی نـەدەکرد. پـاش ماوەیـەك کـوروش سـوپایەکی پێـك هێنـاو ئامادەی جەنگی یۆنانیەکان بوو.

پاشان لەلایەن یۆنانیەکانەوە نوێنەرێکیان ناردە لای کـوروش‌و داوای ئاشتیان کرد، کوروش چیرۆکێکی بۆ نوێنەرەکە گێرایەوە وتی:

سەردەمێك نەیژەنێك هەبوو بیری دەکردەوە: "ئێستا دەچمە کەناری دەریاو نەی دەژەنم، تا ماسییەکانی دەریا بێنـە دەرەوەو سـەما بـۆ نـەی ژەندنەکەی من بکەن، پاشان ماسییەکان دەگرم." ئەنجا رۆشـتە کـەناری دەریاو دەستیکرد بە نەی ژەندن، بەڵام هیچ ماسییەك دیار نەبوو، پاشان نەیـژەن تـۆڕی خسـتە دەریاکـەو ژمارەیـەك ماسـی ڕاو کـرد. ماسـییەکان

چونکە کەوتبونە تۆڕەکەوە دەستیان بە هەڵبەزو دابەز کرد.

نەیژەنی ماسیگر وتی: "ئێستا درەنگە، دەبوو ئەو کاتەی کە من نەبیم دەژەند سەماتان بکردبایە، تازە وەخت درەنگە!"

کوروش وتی: "ئێستا من ئەو ماسیگرەمو ئێوەش ئەو ماسیانەن!"

پاشان هێرشی بۆ یۆنان کردو بەسەریاندا زاڵ بوو!

ناپلیۆن پۆناپارت دەڵێت:

هەمیشە باس لە ئاشتی بکە، بەلام ئامادەی جەنگ بە.

## نزاو پارانەوەو گریان نیە
## هاودڵی و یەکتاییە لەگەڵ خودا
## "جولی ستن سیرز"

### هێزی نزاو پاڕانەوە

"بتی جین" لە کتێبەکەیدا بەناوی لە ئامێزی نوردا دەنوسێت:

لە ساڵی ١٩٧٣ لەو ماوەیەی لە نێوانی مەرگو ژیاندا بەسەری دەبرد، فریشتەکانی بینی بۆ وەڵامی نزاکانی دێنە لای. ئەوان لە کاری خۆیان پڕ لە عەشقو شادی بوون. نزاکان درەوشانەوەی نورێك بوون لە زەویەوە بەرەو مەلەکوت بەرز دەبوونەوە. ئەو دەڵێت:

"بەئاشکرا پێیان وتم، تێکرای نزاکانت وەڵام دراونەتەوە، من دەرکم بەوە کرد پێویستە متمانە بە هێزی پەروەردگار بکەین، ئەو نیازەکانی ئێمە لە هەموو کاتەکاندا هەست پێ دەکات تەنها چاوەڕوانی داخوازی ئێمەیە تا بەهانامانەوە بێت، ئەو خاوەنی توانای وەڵامدانەوەی نزاکانە، کاتێ ئێمە راستگۆیان داوا دەکەین، بێگومان مسۆگەری دەکەین."

جی.پی. ڤاسوانی، بەدیدێکی عاریفانەوە دەربارەی نزا دەڵێت:

پێویست نیە نزای دیاریکراوو نوسراوە بۆ خودا بکەین، نزا دەبێ لە دڵێکی پڕ لە عەشقەوە سەرچاوە بگرێ، ڕەنگە نیگایەکی پڕ خۆشەویستی یان هەناسەیەکی قووڵ لەلای خودا، زیاتر لە هەزاران نزای دیاریکراو نوسراوەی ڕۆژانە پەسەند بێت، نزا کردن هەستو سۆزی پێویستە، گرنگتر لەو وشانەی دێت بەزماندا شەپۆلی عەشقە وشەکان پێك دێنێت.

**ئەو کاتەی ناختان ئازادو بەتاڵە لەهەر جۆرە نەفرەتێك،**
**ئەو کارەی دەبێت بیکەن، باشتر ئەنجامی دەدەن.**

**نەفرەت**

ئارش تەمەنی حەوت ساڵە، شەیدای کۆلارە هەڵدانە، ڕۆژێکیان وەك هەمیشە، کۆلارەکەی هێنایە کۆڵانو هەڵیدا بەئاسماندا. کۆلارە هێندە بەرز بویەوە چیتر لە چاو وونبوو، ڕێبوارێك بەوێدا تێپەڕی بینی پەتێکی بەدەستەوەیە، لێی پرسی چی دەکەیت؟ ئارش وتی: "کۆلارە هەڵدەدەم." ڕێبوارەکە، هیچ کۆلارەیەکی نەدەبینی، پێی سەیر بوو وتی: "چۆن دەزانی ئێستا کۆلارەکەت بە ئاسمانەوەیە؟"

ئارش وتی: "دەتوانم هەستی پێ بکەم، چونکە قورساییەکەی بەدوای خۆیدا کێشم دەکات."

**خاڵی سەرنج:**

ئێوە کۆلارەی ڕقو قینی چەند کەسێکتان بە ئاسمانی خۆتاندا هەڵداوە، ئەوان بەدوای خۆیاندا کێشتان دەکەن؟

یاسای ژیانی ئێمە ئەمەیە کاتێك لە دۆستو ئاشناکانمان دڵگران دەبین، بۆ جڵەوکردنی پەستانە دەرونیەکان، پەیوەندیان لەگەڵ دەبچڕێنینو نامانەوێ چاومان پێیان بکەوێت، وادەزانین پەتی خۆمان لەوان بچڕاندووە، بەبیرکردنەوە لە هەڵەو خەتاکانی ئەوان و دروستکردنی هەستی نەفرەتو قین، بواریان بۆ دەڕەخسێنین هەمیشە لەژیانی دەرونیماندا هەبن، هەرچەند ئێمە ئەوان نابینین، بەڵام ئەوان بەلای خۆیاندا کێشمان دەکەن.

نەخواستن‌و نەتوانین، یەکەم پلەکانی سەرکەوتنە،

بەو مەرجەی پیتی "ن" یان لێ بسڕینەوە!

هێزی خواستن

دکتۆر شەریعەتی، خواستن بە فاکتەری سەرکەوتن دێنێتە هەژمار دەڵێت: ئەگەر خواستن بەتەواوی وجودیەوە هەموو ئەندام‌و تواناکانی ڕۆح داگیر بکات. ئەگەر هەموو وجودی خۆمان لە یەك خواستدا چڕ بکەینەوە، ئەگەر هێرش‌و شاڵاوی ڕاستگۆیانەی پڕ لە یەقین‌و هیواوە "بخوازین"، وەڵام وەردەگرین.

"مارك فیشەر" دەڵێت: خواستن مایەی مانەوەی ئەندێشەکانە، هەرچەند خواستن بە تینتر بێت، خواستەکانت بە خێراییەکی زیاتر لە ژیاندا ڕەنگ دەداتەوە!

هەموو شتێك پێوەرێکی هەیە

پێوەری پیاو، ئازارەکانیەتی.

"ئەبو سەعید ئەبولخەیر"

ڕازی هەموو دەرمانەکان

لە عاریفێکیان پرسی: نهێنی دەواو دەرمان چیە؟

وتی: دەرد!

وتیان: لەکوێ بیدۆزینەوە؟

وتی: لە پیاودا!

وتیان: نیشانەی پیاو چیە؟

وتی: ڕەنگی زەرد!

وتیان: دوای ئەوە؟

وتی: ئارامگرتن لەکاتی شالاوی هەواو هەوەس، هێمنی لە کاتی تووڕە بوون و قین.

**هەرگیز نابێ بازەکان بخرێنە قوتابخانەی قازەکانەوە،**

**نابێ بیرکردنەوەی نەشیاوی قازەکانخەیاڵی بازەکان**

**سەرقاڵ بکات**

هەموو قازەکان وەکو یەك بیر دەکەنەوە، هەمیشە بانگەشەی ئەوە دەکەن، بیر کردنەوەیان کۆپی کراوێکەو بەدهێنانیان نیە، زۆرجار هەموویان پێکەوە یەك ئەنجامیان هەیە.

بازەکان دەزانن ئەو کاتەی هەموویان وەکو یەك بیر دەکەنەوە لەراستیدا کەسیان بیر ناکەنەوە.

قازەکان دەزانن قاز چیتر چۆن دەژی، هەرکەسەو لە جیاتی کەسێکیتر بریار دەدات، هەر بۆیە زووتر یا درەنگتر بەگەشەی "فیکری، جنسی، هەستیاری" دەگەن، یان پێناگەن و گەشە ناکەن.

بازەکان برواین بە بەدیهێنانی زەینی هەرکەسێك هەیەو لە ژیاندا کەسەکە فێری ماسیگریی دەکەن، نەك ماسی پێبدەن! لە ژینگەی بازەکاندا هەرکەس دەبێ بۆ خۆی بیر بکاتەوەو کەسیش بەرپرسیاریەتی کەسێکی دیکەی لە ئەستۆدا نیە.

قازەکان جەستەی خۆیان زۆر ماندوو دەکەن، تێکرای توانای خۆیان بەگەڕ دەخەن و ئاکامی دڵخوازی خۆیان مسۆگەر ناکەن.

بازەکان سەرەتا تێکڕای لایەنەکانی کار لەبەرچاو دەگرن، بە پشت

بەستن بە ئەزمونەکانی پێشترو پلانرێژیی زەینی بەدیهێنەرانەیان، بریار دەدەن‌و پاشان دەستبەکار دەبن.

بازەکان باوەڕیان وایە هەوڵی جەستەیی، بەتەنیا بەس نیە بۆ کار کردن.

قازەکان هەرێمی تایبەتیان نیەو چەندین جار دەچنە هەرێمی تایبەتی بازەکانەوە، چونکە حورمەتیان نیە.

بازەکان ڕێز لە حەرەمی هەر کەسێك دەگرن‌و راشکانەوە هەرکەسێ بچێتە حەرەمیانەوە ئاگاداری دەکەنەوە.

قازەکان دەبێت هەموو رازی بن تێکرای هەوڵەکانیان بۆ رازیکردنی هەمووانە، لەجیاتی ئەنجامدانی ئەرك‌و پەیامەکانیان بە زەحمەتێکی زۆر، رەزامەندی هەموو لایەك بەدەست دێنن، چونکە ئەگەر بەدەستی نەهێنن هەست بە بۆشایی دەکەن. بازەکان دەزانن بەدەست هێنانی رەزامەندی هەموو کەسەکان سەر ناگرێت‌و نیوەی خەڵکی هەمیشە لەگەڵ نیوەی بیرکردنەوەی ئەواندا ناکۆکن‌و ئەمەش ئەرکی بازێك نیە نەیارەکانی رازی بکات.

قاز، "نەخێر"ی نیەو ناڵێت هەمیشە سکاڵای هەیە کە بۆچی هێندە گوێ بە خەڵکی بدات.

باز لەکاتی پێویستدا، بە ئاسانی "نەخێر" دەڵێت.

قاز، مەرجی یەکەمی پەیوەندی پەرۆشی لەرادەبەدەر دەزانێت.

باز مەرجی یەکەمی پەیوەندی ڕێزی بەرامبەر دەزانێت.

قاز، نایەوێ باوەڕ بەوە بکات کە دوژمنی هەیە.

باز، دەزانێ کە دەبێ لە دوژمن خۆش بێت، بەڵام باوەڕی پێناکات.

قاز، پەند لە ئەزمونەکان وەرناگرێت، تەنها ئازار دەبینێت.

باز، دوای تێپەڕاندنی سەختی پرسەکان، لە بیری وەرگرتنی پەندو ئەزموندایە.

قاز، هیچ کاتێ قسەی دڵی ناکات.

باز، لەگەڵ دڵیدا دەژی.

قاز بەگشتی یان هەستیاریە یان مەنتیقی.

باز، دەزانێ لە ژیاندا دەبێت دەمێک مێشک پەروەردە بکات، دەمێکیش دڵ بلاوێنێتەوە، بەها بۆ قسەکانی دڵ دابنێت.

قاز، هەڵە ناکات.

باز، دەزانێت ئەگەر هیچ کاتێک هەڵەیەکی نەکردووە، هۆیەکەی ئەمەیە دەستی لە کارێك نەداوە.

قاز، لە جیاتی کەسانیتر دەژی.

باز، دەزانێ دەبێ کۆمەکی کەسانیتر بکات، بەڵام نابێ لە جیاتی کەسێکیتر بژی. چونکە ئەزمونی خۆبوون لەو کەسە وەردەگرێ.

قاز، هەمیشە دەتوانێ هەموو کارێك ئەنجام بدات.

باز، دەزانێ دەتوانێ چ کارێك ئەنجام بدات، لە کوێ ڕایگەیێنێ کە دەرەقەتی نایەت.

قاز، هەمیشە ناچارە.

باز، هەمیشە سەرپشکە، ئەگەر بە زۆری ڕۆژگار ناچار بە ئەنجامدانی کارێك بوو، پەسەندی دەکاتو دەڵێت: پێم باشترە ئەم کارە ئەنجام

بدەم.

کاتی گەشتو گوزاری قاز دیاریکراو نیە.

باز، بۆ گەشتو گوزار پلانرێژیی دەکات، دەزانێ مەودای بەتاڵی نێوانی ئەم نۆتەیە تا نۆتەی دواتر لە مۆسیقادا، هۆکاری بەدڵبونیەتی.

قاز، هەمیشە ناڕازیەو هەمیشە لە حاڵەتی دۆزینەوەی هۆکاری بەدبەختیەکانە.

باز، هەمیشە ڕازییەو دەزانێ هەموو سەختیەك کۆتایی هەیە.

باز، دوپاتکردنەوەی خووی ڕۆژانە بەمردنی دڵو پەرستن دەزانێت.

قاز، سەبارەت بە باز، یان هەستی زیاتر لەخۆی دەکات یان لاوازی.

باز، باوەڕی وایە زیاتر لەخۆی بوونی نیەو ئەسڵیش تەنها جیاوازیە کە دیارە هۆکاری زیاتر بوونی کەسێك بەسەر کەسێکی دیکەدا نیە.

قاز، فشارێکی زۆر لەمێشکی خۆی دەکات، دیارە بەبێ بەهرەوەریی پێویست.

باز، بیری بەسوود دەکاتەوە، پەند لە هەڵەکانی وەردەگرێت.

قاز، دەیەوێت قاز بێت، چونکە بوونە قازو نەفڕین، گەلێ ئاسانترە لە پەروازو چوونە لوتکە.

باز، لەسەر باز بوونی خۆی جەخت دەکاتەوە، تەنانەت ئەگەر چەن جارێك بچێتە قوتابخانەی قازەکانو لەبەر باز بوونی بەهایەکی گرانیش بدات.

ئەو کەسەی دەیەوێ لەگەڵ بازەکاندا پەرواز بکات لەگەڵ مراویەکاندا مەلە ناکات."تی هارفر ئیکر"

**باشترین دۆستو هاوڕێم ئەو کەسەیە**

**لە من باشترین دروست بکات.**

**"هێنری فۆرد"**

## دۆستو هاونشینی گونجاو

لە وڵاتی رۆم، لاوێك دەژیاو خاوەنی باخێکی سەوزو جوان بوو. لەگەڵ مەیمونێکدا هاودەمیو هاوڕێیەتی دەکردو پەیوەندیەکی پتەویان هەبوو، لەلایەکی دیکەشەوە لاوە باخەوانەکە دژایەتی لەگەڵ مارێکدا هەبوو، چونکە ئەو مارەکەی بریندار کردبوو، مارەکە ڕقو کینەی لێ هەڵگرتبوو لەهەوڵی تۆڵە سەندنەوەیدا بوو. باخەوانەکە لە ترسی تۆڵە کردنەوە ئارامیو ئاسودەیی لێ تێکچوو بوو تەنانەت خەویشی لێ هەڵگیرا بوو.

سەرەنجام رۆژێك ماندوێتی زۆری بۆ هێناو، بێڵەکەی سەرەو خوار کردو لێی خەوت. مار ئەم دەرفەتەی قۆستەوەو لەسەری ئامادەبوو، بیرێکی کردەوە وتی گەر بێتو من بریندار بکەمو نەمرێت، بێدار دەبێتەوەو دەمکوژێت، کەواتە شاڵاوی کتوپڕ ئاقڵانە نیە، وتی دەبێت بدەم بە شوێنێکیەوە نەتوانێ جوڵە بکات. دوای کەمێك بیرکردنەوە بەخۆی وت: "هیچ شوێنێك لە جەستەی مرۆڤدا لەگلێنەی چاوی ناسکتر نیە، باشتر وایە بە سینگیدا هەڵگەڕێمو بدەم بە چاوییەوە نەتوانێ چاو بکاتەوە." هەرکە ویستی بە سینگیدا هەڵگەڕێت، لاوەکە لەدەنگی کەوتنە

خوارەوەی مارەکە بێدار بویەوە، بێڵەکەی هەڵگرتو مار بەهەزار زەحمەت خۆی خزاندە کونێکەوە.

لاوی باخەوان هەرکە لەم گێژاوە دەرباز بوو، بەخۆی وت: "ئەی نەفس! خەوو مەرگ، گەر بخەویت، واز لە گیان بێنە، گەر گیانیشت دەوێ واز لە خەوبێنە."

ماوەیەك تێپەڕیو باخەوان نەیتوانی بخەوێت، بێجگە لە خەوتنیش هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو. ئەم بەسەرهاتەی بۆ مەیمون گێرایەوە کە دۆستی دڵسۆزی بوو، داوای چارەسەری لێکرد.

مەیمون وتی: "چارەی ئەمە ئاسانە، هەرکاتێ تۆ خەوت هات لەسەر متمانەی من بخەوەو هیچ خەمێکت نەبێت، هەرکاتێك مار هات من وەکو خوری شیی دەکەمەوە سەری دەدەم لەبەرد."

لاوەکە لەم قسەیە دڵنیا بوو، چووە خەونی شیرینەوە، خەوێکی وەهای لێکەوت بە نەفخی سوری ئیسرافیل بێدار نەدەبویەوە.

بەم حاڵەوە مێشو مەگەزێکی زۆر لە باخەوان کۆ بوونەوەو مەیمونیش دەریدەکردن تاکو ئازاری هاوڕێکەی نەدەن، بەڵام مێشەکان کۆڵنەدەر بوون، مەیمون توڕە بوو وتی: "ئێستا هەموتان لەناو دەبەم."

لە جێی خۆی هەستاو بە ناو باخەکەدا گەڕاو بەردێکی گەورەی قورسی هەڵگرت تا مێشەکانی پێ بکوژێت، مەیمون بەم خەیاڵەوە بەردەکەی هەڵگرت بەهەموو هێزی خۆی وەشاندی، مێشەکان بەسەلامەتی دەرچون، بەڵام لاوی باخەوان چیتر بێدار نەبویەوە.

لاوی بەدبەخت، مارەکە چونکە ژیر بوو لەخۆیەوە بریندارى نەکرد،

بەلام مەیموون کە دۆستی نەفامی بوو متمانەی پێکرد ئەمەی بەسەر هێنا.

بۆچی هەڵبژاردنی هاوڕێی راستەقینە هێندە گرنگە؟ چونکە زۆرترینی کاتەکانی تەمەن لەگەڵ ئەودا بەسەر دەبرێت.

نێوانی عاشق و مەعشوق پەردەیەك نیە

تۆ خۆت پەردەی خۆتیت لەو نێوانەدا هەستە

"حافزی شیرازی"

لە سوڵتانی عاریفان "ئەبو بەکری شیبلی"یان پرسی: "تۆ لەکەیەوە گەیشتویتە قۆناغی کەماڵ؟"

وتی: "بە کۆڵانێکدا تێدەپەڕیم، سەگێکم لە کەناری جۆگە ئاوێکدا بینی، دەیویست ئاو بخواتەوە، بەلام بەدیتنی وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا وایدەزانی سەگێکی دیکە هەیە، دەترساو دەکشایەوە، ئەم هاتنەوە پێش و کشانەوەیە نزیکەی سەعاتێکی خایاند. لەناکاو سەگەکە سەری کرد بە نێو ئاوەکەداو زانی کە سەگێکی دیکە لە نێو ئاوەکەدا نیە. بەڵکو خۆیەتی هێندە تینوی کردووە، کاتێ خۆی نەبینی بە ئاسودەیی تێراو بوو، بەدیتنی ئەم دیمەنە تێگەیشتم کە حیجاب و بەربەستی من لە گەیشتنم بە کەماڵ، خۆ بینی خۆمەو لەوە بەدوا کۆشام چیتر خۆم نەبینم و بیر لەخۆم نەکەمەوە، تاکو ڕێگەی بەختەوەری بدۆزمەوە."

حیجاب لە نێوان بەندەو خوداو ئەرش و کورسیدا نیە

حیجاب، خەیاڵی پووچ و خۆ بەزلزانی و غرورە.

ئەمانە لە خۆت لادە. دەگەیت بە خودا.

ئەو کەسانەی لاسایی دەکەنەوە
سەرئەنجام کۆپیەکی پلە دووی
لاسایی کردنەوەی خۆیانن.
"دیل کارنگی"

مەلای مەشهور چووە مزگەوتێکەوە دانیشت، کراسەکەی کەمێك کورت بوو، ئەو پیاوەی لە دوایەوە دانیشتبوو، بە بیانوی گاڵتە کردن بە مەلای مەشهور، دەستی برد کەمێك کراسەکەی بۆ داکێشایەوە.

مەلا، لەو مزگەوتەدا غەریبو تازە هاتوو بوو، وایزانی دابو نەریتی ئەم مزگەوتە بەم شێوەیەیە. ئەویش کراسی کەسەکەی بەردەم خۆی بەو جۆرە داکێشایەوە.

پیاوەکەی بەردەمی ئاوڕیدایەوە بە توڕەییەوە وتی: "ئەوە چی دەکەیت؟"

مەلا بەپەلە وتی: "لە من مەپرسە، لەوەی دوامەوە بپرسە!"

دیل کارنگی دەڵێت:

لاسایی کەسانیتر مەکەرەوە، خۆت بناسە، هەرچیەکیت هەر ئەوەبە، بزانە لە دنیادا هیچ کەسێك وەکو تۆ نیە.

سەرکەوتن واتا هەبوونی ئامانج
بەدەر لەمە هەرچی هەبێ زۆر بڵێیە.
"برایان تریسی"

**ئامانج**

لە ڕۆژێکی بەفرباریندا، بەڕێوەبەری قوتابخانەیەك هەموو قوتابیەکان بانگ دەکاتو پێیان دەڵێت کێ دەتوانێ لەمبەری دیوارەکەوە بۆ ئەو بەری دیواری گۆڕەپانەکە بە هێلێکی ڕاستدا بڕوات. بە ڕواڵەت کارێکی ئاسان بوو هەموو دەیانتوانی ئەنجامی بدەن، بەڵام سەرەنجام یەك کەس هەبوو لەسەر هێڵێکی ڕێك ڕۆشتبوو، ئەوانیتر بە ڕێگای پێچاو پێچدا ڕۆشتبوون، هۆکاری سەرکەوتنی ئەم قوتابیە ئەمە بوو، درەختێکی لەو بەرەوە نیشانە کردبوو، تەنها سەیری ئەوەی دەکرد، بەمشێوەیە توانیبوی بەسەر هەموو ئاستەنگەکاندا تێپەڕ بێت، بەڵام قوتابیەکانی دیکە سەیری بەر پێی خۆیانیان کردبوو، کاتێ توشی کۆسپێك بوبوون ئاراستەیان گۆڕی بوو.

**سەرنج:**

گەر دەتانەوێ شاد بژین، ئامانجێك بۆ خۆتان دیاری بکەن، کە فەرمان بە بیرکردنەوەتان بدات، وزەی خۆتان ئازاد بکەن ئیلهام بەخشی هیواو ئارەزوەکانتان بێت.

وەفادار بین، لۆمە بکرێین، کەسێکی باش بین
چونکە لە تەریقەتی ئێمەدا دڵشکاندن کافرییە.
"حافزی شیرازی"

بەخشین

دوو هاوڕێ، بە پیادە بە بیابانێکدا ڕێیان دەکرد. لە ڕێگا، لەسەر شتێك تێکچوون و مشتومڕ کەوتە نێوانیان.

یەکێکیان زۆر تووڕە بوو، زللەیەکی لەویتریاندا، ئەوەی زللەکەی خواردبوو ئێشێکی زۆری پێ گەیشت، بەڵام بێئەوەی هیچ بڵێت لەسەر لمی بیانەکە نوسی: "ئەمڕۆ هاوڕێ دڵسۆزەکەم زللەیەکی لێدام."

پاشان لە ڕێکردن بەردەوام بوونەوە تاکو گەیشتنە ئاواییەك. بڕیاریاندا کەمێك لەوێ بمێننەوە. لەلای چۆم و ئاوێکدا پشوویەك بدەن، لەپڕ ئەوەی زللەکەی خواردبوو، لەرزی و کەوتە ئاوەکەوە، خەریك بوو نوقم بێت و بخنکێت، هاوڕێکەی فریای کەوت و ڕزگاری کرد. لەسەر تاشە بەردێك ئەم ڕستەیەی هەڵکۆڵی: "ئەمڕۆ هاوڕێ دڵسۆزەکەم گیانی منی ڕزگار کرد."

هاوڕێکەی بە سەرسامیەوە لێی پرسی: "دوای ئەوەی من بە زللەیەك ئازارم پێگەیاندی، تۆش ئەو ڕستەیەت لەسەر لمی بیابانەکە نوسی، کەچی ئێستا ئەم ڕستەیە لەسەر ئەو بەردە هەڵدەکۆڵیت؟"

پێکەنی وتی: "کاتێ کەسێك ئازارمان دەدات، دەبێ لەسەر لمی بیابان بنوسرێت بۆ ئەوەی بایەکانی بەخشین بیسڕنەوە، بەڵام کاتێ کەسێك چاکەیەکمان لەگەڵ دەکات دەبێت لەسەر بەرد بینوسین تاکو هیچ

بابەك نەتوانێ ئەوانە بیر بباتەوە."

سەرنج:

یەكێ لە مەزنترین دەسەڵاتەكانی مرۆڤ، توانایی چاو پۆشیو قوتدانەوەی ڕەفتاری هەڵەی كەسانیترە، گەورەیی و بچوكی هەڵەی كەسانیتر ڕێژەییەو پەیوەندیەكی ڕاستەوخۆی بە گەورەیی و بچوكی ئێمەوە هەیە، گەر ناتوانن كەسێك ببەخشن و هەڵەكەی ناشێت بۆ بەخشین، بابەتەكە پەیوەندی بە دنیای دەرەكی و گەورەیی هەڵەی كەسانیترەوە پەیوەست نیە، بەڵكو پەیوەستە بە داماوی و بچوكی خۆمانەوە، پێم بڵێ چ هەڵەیەك شایانی بەخشین نیە، تاكو خۆتت پێ بناسێنمەوە تا بزانیت لە چ پلەیەكی گەشەو بەتوانایی تایبەتیدایت.

- هەرچەن ئێمە گەورەتر بین، هەڵەی كەسانیتر بچوكتر دەردەكەون، هەرچەن بچوكتر بین، هەڵەی كەسانیتر گەورەترو شایانی نەبەخشین دەردەكەون.
- هەرچەن ئێمە گەورەترو بەتواناتر بین، كەمتر نیازمەندی كەسانیترین.
- هەرچەن كەمتر نیازمەند بین، كەمتر ئازار دەچێژین.
- هەرچەن كەمتر ئازار بچێژین، ئاسانتر دەبەخشین.

حەكیمێك دەڵێت:

ئەو كەسانەی، كەسانیتر نابەخشن...

واتا هەمیشە لە ڕابوردودا دەژین...

ئەوانەی لە ڕابوردودا دەژین...

ساتەوەختی ئێستایان وێرانە...

## چیرۆکی زبان

پیاوێك تەلەفۆنی بۆ پزیشكی ددانەكەی خۆی كرد، لەبەر كەلێنێكی گەورەی ددانێكی كاتێكی زۆری لێگرت، كاتێ پیاوەكە چووە سەر كورسی چارەسەركردنەكە پزیشك سەیری ددانەكەی كرد وتی: "شتێكی ئەوتۆ نیە ئێستا بۆت پڕ دەكەمەوە."

پیاوەكە وتی:" بەراست؟ كاتێ زبانم پێدا دەهێنا وامدەزانی كەلێنێكی گەورەی تێ بووە."

پزیشكە بە پێكەنینەوە وتی: "شتیكی ئاساییە، چونكە یەكێك لە كارەكانی زبان زیادە ڕۆییە، وانیە؟"

شاعیرێك زبانو زیان بە یەك شت دەزانێ دەڵێ جیاوازی نێوانیان تاقە خاڵێكە...

بوار مەدەن زمانتان لە سنوری بیركردنەوەتان تێپەڕ بكات..

"شیلون"

بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو کەسەیە
باشترین خەیاڵی لەسەردا بێت.

"ولیم لیۆن"

دیدگای ئەرێنی

پیاوێك دوو کوڕی "جمك" دوانەی هەبوو، ئەم دوانەیە لە زۆر لایەنەوە هاوشێوەی یەکتریی بوون. بەڵام دیدگایان جیاواز بوو. گەورەکەیان هەمیشە نەرێنیانە لە هەموو شتێکی دەڕوانی، کوڕە بچوکەکە بە پێچەوانەوە، رۆژێك باوکیان بەڵێنی پێدان دیاریەکی رۆژی لەدایکبوون بۆ هەردوکیان بکڕێت، لەو رۆژەدا گەورەکەیان پاسکیلێکی نوێی بە دیاری وەرگرت، بەڵام بەدڵی نەبوو وتی: "ئەم پاسیکلە هەم جوانەو هەم گران، ناچارم زۆر بیپارێزم، چونکە هەر ساتێ ئەگەری ئەوەی هەیە یەکێك بیدزێت، پاراستنی ئەرکێکی گرانە."

دیاری کوڕی بچوك لە پاکەتێکدا پێچرابوو، کاتێ کردیەوە زۆری پێخۆش بوو، چەند ئەسپێکی یاریکردنی بچوکی تێدا بوو، خێرا دەستی کرد بە یاری پێکردنی، باوکی بە زیرەکی هەستی بەم کاردانەوەیە کرد لێی پرسی بۆچی سەر بە هەموو شوێنێکدا دەکەیت؟

کوڕی بچوك وەڵامیدایەوە: "بابە! من دەزانم ئەسپێکت لەم ناوەدا شاردۆتەوە. دیاری رۆژی لە دایکبونەکەی من هەر ئەو ئەسپەیە وانیە؟

سەرکردەی سەرکەوتن، یان ناکامی تەنها دیدگایە...

"جۆنسی مکسول"

## ئیرەیی

ڕۆژێکیـان مـەلای مەشـهور چـوو بـۆ لای هاوڕێیـەکی پێـی وت: "بزانـە هاوڕێم من زۆر بەزەییم بە تۆدا دێتەوە."

هاوڕێکەی وتی: "بۆچی؟"

مـەلا وتـی: "لەبـەر ئـەوەی دوای ئـەو هـەموو شـەڕو ئاژاوەیـە لەگـەڵ خێزانەکەم، ئەمڕۆ چوومە بازاڕ هەرچیەکی ویست بۆم کڕی."

هاوڕێکەی وتی: "ئەمە چ پەیوەندیەکی بە منەوە هەیە؟"

مەلا وتی: "پەیوەندی بە تۆوە زۆرە، ئاخر کاتێ ژنەکەی تـۆ بزانێـت من جلو پێڵاوم بۆ ژنەکەم کڕیوە، ئـەویش ئیرەیـی دەجوڵێتو دەیکاتـە شـەڕو ئـاژاوە، تـاکو خواسـتەکانی بـەدی نـەهێنیت دەسـت لەبـەرۆکت ناکاتەوە."

لۆرد ئاڤیبوری دەڵێت:

ئیرەیـی لـە ژەهـری مـار مەترسـیدار تـرە، ژەهـری مـار زیـانی بـۆ کەسانیترە، بـەڵام کەسـی چاوچـنۆك زیـاتر لـە هـەموو کـەس بەدەست خۆیەوە ئازار دەچێژێت.

**مایەو بنەمای هەر چاکەیەك راستییە**

**راستی لەهەر شوێنێك بێت چاکە دەدۆزێتەوە.**

**"ناصر خەسرەو"**

**راستگۆیی**

دەگێڕنـەوە کـە سـوڵتانی عاریفـان "بایەزیـدی بەسـتامی" کاتـێ دەیویست بۆ خوێندن بچێتە بەغـداد، دایکـی ئامۆژگـاری کـرد لـە هـەموو کارەکانی ژیانیدا راستیو ڕاسـتگۆیی بکاتـە پیشـەو بـە هـیچ جـۆرێ درۆ نەکات. داوای لێکرد بەڵێنی پێبدات بەگوێی ئامۆژگاریەکەی دایکی بکات. بایەزید پەسەندی کرد، دایکی ئەو چل دینارەی بەمیرات لە باوکیەوە بۆی بەجێ مابوو، پێیدا بۆ خەرجی سەفەرەکەی.

بایەزید لەگەڵ ئەو کاروانە بەڕێکەوت کە بۆ بەغدا دەچوو. پاش بڕینی ماوەیەك ڕێگا، دەستەیەك لەچەتەو ڕێگرەکـان گـەمارۆی کاروانەکەیانـداو ویسـتیان ڕوتیـان بکەنـەوە. پاشـان دەسـتیان کـردە پشـکنینی یـەك بـە یەکیانو دارو نەداری کاروانەکەیان کۆ کردەوە، کاتێ نۆبەی بایەزید هات، یەکێك لە چەتەکان وتی: "لە قیافەیدا دیارە ئەمەیان هیچی پێ نیە، جلو بـەرگی کـۆنو شـڕەو خـاوەنی شـتێك بوایـە پێـوەی دەردەکـەوت." چەتەیەکی دیکە وتی: "هێی، کورە... کاتمان بەخۆتەوە بەهەدەر مەدە. ئایا پارەیەکت پێیە؟"

بایەزیـد وەلامیدایـەوە: "بـەڵێ" چـەتەکان دایانـە قاقـای پێکـەنین، یەکێیان لێی پرسی: "چەندە پارەت پێیە؟" بایەزید وتی: "چل دینار" چەتەکان گاڵتەیان پێکرد. یـەکێیان وتـی: "لێـی گـەڕێن کـاتی پێـوە

بەهەدەر مەدەن. سەر دەستەکەمان چاوەڕێمانە."

چەتەکان چونە لای سەر دەستەکەیان، ئەویش لێی پرسین: "ئایا هەموو شتێکتان کۆ کردۆتەوە؟"

چەتەکان قسەکانی بایەزیدیان بۆ سەردەستەکەیان گێڕایەوە. سەردەستە وتی: "ئەو کەسەم بۆ بێنن، بابزانم بۆچی وای وتووە."

چەتەکان بایەزیدیان هێنا، سەردەستە لێی پرسی: "ئایا شتێکت پێیە ئەی لاوەکە؟"

بایەزید وتی: "بەڵێ، چل دینارم پێیە."

سەردەستە وتی: "ئایا تۆ شێت بویت، چۆن پارەی خۆت بەئارەزووی خۆت دەدەیت بەمن، دەزانی کەمن پێت نادەمەوە؟"

بایەزید وتی: "من بەڵێنم داوە بە هیچ جۆرێ درۆ نەکەم."

سەردەستە وتی: "سوێن بەخوا من ژیانم لە ئازاردانی خەڵکیدا بەسەر بردووە، تۆش ترسی شکاندنی بەڵێنێکت هەیە، ئێمە لە شکاندنی بەڵێنی خودا ناترسین، سوێن بەخوا چیتر من دزیی ناکەمو دەگەڕێمەوە بۆ لای خودا، بەڵکو خودا لێم خۆش بێتو تۆبەکەم لێ وەرگرێت."

چەتەکان دوای بیستنی قسەی سەردەستەکەیان وتیان: "ئێمە پەیرەویمان لە یاخی بوونی تۆ دەکرد، لە تۆبەو پەشیمان بونەوەش هەر پەیڕەویت لێ دەکەین، چونکە لە چەتەیی‌و ڕێگریدا پێشەوامان بویت، لە تۆبەو گەڕانەوەشماندا پێشەوامانبەو تۆ گەورەو سەروەری ئێمەیت."

چەتەکان هەرچیەکیان تالان کردبوو گەڕاندیانەوە بۆ کاروانەکەو تۆبەیان کردو کاروانەکە بەرەو بەغداد بەڕێکەوتەوە.

**منالەکانتان وەکو گوڵو درەختەکان**
**بۆ پەروەردەو فێر کردن پێویستیان**
**بە تیشکی خۆرەتاوە.**
**"حەزرەتی محەمەد"**

## مەشخەڵ

ژمارەیەك لە دایکانو باوکان، لەبەر دەرگای یەکێك لە هاوسێکان دانیشتبوونو دەربارەی ژیانو ئایندەی منالەکانیان گفتوگۆیان دەکرد. ئەوان دەربارەی ژینگەیەکی نەشیاوو توندو تیژیی‌و بێ هیوایی ژیانیانی ئەوان دەدوان. پرسیاری سەرنج کێشیان دەکرد، بە هۆی ئەو تاریکیەی باڵی بەسەر جیهاندا کێشاوە ئایا باوکانو دایکان دەتوانن بەجۆرێك ژیانیان بۆ ڕوناك بکەنەوە؟ یەکێك لەوان کە مامۆستا بوو وتی: "بەبڕوای من ئێمە توانای گۆڕینی ژیانی منالەکانمان هەیە بەو مەرجەی ڕۆڵی مەشخەڵێکی داگیرسێنەر ببینین."

ئەوانیتر وتیان: "چی؟ مەشخەڵی داگیرسێنەر؟ ئەمە چ مانایەکە؟"

مامۆستا ڕوونی کردەوە" لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا ئێمە مەشخەڵانێکمان هەبوو کە چرا نەوتیەکانی سەرجادەکان بەو ڕۆشن دەکرانەوە، ئەو مەشخەڵە تیرەیەکی درێژ بوو مۆمێك بە کۆتاییەکەوە بوو، بەوەش چراکانی دیکەی پێ هەڵدەکرا، لە دورەوە کە دەتبینی خودی مەشخەڵەکە دیار نەبوو، چونکە تیشکی مۆمەکە هێندە کز بوو کە توانای

ڕەواندنەوەی تاریکی شەوی نەبوو.

مەشخەڵ بەو شێوەیە پێشکەوت، چراکانی دیکەی روناک دەکردەوە، روناکی مۆمەکەی بە زەحمەت دەبینرا، بەڵام هەرجارێك یەکێك لە چراکانی شەقامێکی ڕوناك دەکردەوە، تاریکی تاڕادەیەك دەڕەویەوە، گەر لە پشتەوە لێت بڕوانیبایە روناکی چراکان هێندە شەقامەکەیان ڕوناك کردبویەوە وەك ئەوەی شەو نەبێتو تاریکی لەئارادا نەبێت.

هەمویان قسەکانی مامۆستایان پەسەند کرد: "هەروایە کە تۆ دەیڵێیت، لەمەودوا هەمومان دەبینە مەشخەڵی منداڵەکانمانو دەبینە سەرمەشقیانو تێدەکۆشین بە تیشکی روناکی خۆمان چرای ژیریو دڵی ئەوان روناك بکەینەوە، بە بەخشینی عەشقو خۆشەویستی سوتەمەنی پێویست بۆ ڕوناك مانەوەی چراکانیان بین. ئێمە بەم کارە کۆمەکیان دەکەین ئەوان ڕوناکی ژیانیان ڕوناکتر بپارێزن تا بتوانن بەسەر تاریکیو نائومێدیدا زاڵبن.

سەرنج:

منالان بەپێی ڕەوشی دایكو باوکی خۆیان دەڕۆن، کەواتە وریای کارو کردەوەی خۆتان بن، ڕونتر منالْ، لە نمونەی زیندو زیاترو باشتر فێر دەبێت نەك راسپاردەو ئامۆژگاری.

جانگری دەڵێت: منالان ناتوانن ئارامیو حەوسەلەیان هەبێت، تاکو هەرچیەکیان دەوێت بەپەلە بۆیان فەراهەم نەهێنرێت.

منالان ناتوانن داهێنەر بن، تاکو بەرپرسێتی هەندێ کاروباریان نەخرێتە ئەستۆ.

منالآن ناتوانن فێری ئازایەتیو گەشینی ببن، تاکو ڕوبەڕوی کێشەو گرفت نەبنەوە.

منالآن بەردەوامیو پایەداریی بنوێنن، تاکو بۆ مسۆگەر کردنی شتێك سەختی نەکێشن.

منالآن، ناتوانن خۆیان هەموار بکەن، تاکو شکستو ناکامی تاقی نەکەنەوە.

منالآن ناتوانن خاوەنی عیزەتی نەفسو مایەی شانازی بن، تاکو هەوڵ نەدەن بۆ مسۆگەر کردنی ئامانج بەسەر ئاستەنگەکاندا زاڵ بن.

منالآن ڕێگاو چاڵ لەیەك جیا بکەنەوە، تاکو دەرفەتی سەرپێچیو وەستانیان پێ نەدرێت.

منالآن هەستی هاوکاریان نابێت، تاکو نەزانن هەموو شتێكو هەموو کەسێك بەوانەوە پەیوەستە.

"دیان لومان" بەحەسرەتەوە دەڵێت:

گەر ڕۆژێك بێتو منالەکەم سەر لەنوێ منال ببێتەوەو بمەوێ پەروەردەی بکەمەوە:

یەکەم، فێری عیززەتی نەفسی دەکەم.

پاشان مالێکی بۆ دروست دەکەم،

لەقامکەکانم... زیاتر بۆ ڕونکردنەوە نەك هەڕەشە لێکردن سوود دەبینم.

کەمتر تەمبێ کردن، زیاتر هاوڕێیەتی دەکەم.

شەوانە لەگەڵ ئەودا زیاتر لە ئەستێرەکان دەڕوانم.

زیاتر عەشقی پێ دەبەخشم، کەمتر هەوڵی لەگەڵ دەدەم.

کەمتر دەربارەی"عەشق بە هێز"و زیاتر "هێز بە عەشق"ی فێر دەکەم.

هەموو بەیانیان‌و ئێوارانێك،

ڕومەتەکانی ماچباران دەکەم.

لە چاوەکانی دەڕوانم،

لەبەر لەش ساغبونی سوپاسی خودا دەکەم.

کتێبی چیرۆکی منالآنە بۆ خۆم چەنجارو بۆ ئەو یەکجار دەخوێنمەوە.

ڕەنگە منالآن گوێگرێکی باشی دایك‌و باوکیان نەبن، بەڵام لە لاسایی کردنەوەیان هیچ کاتێ درێغی ناکەن.

فەرامۆشی نەکەن:

کاتێ، شکستی منالەکانتان بەگەورە دەبینن، کۆمەکێکی کاریگەرتر لە ڕوداوەکانی دواتری ژیانیدا دەکەن.

فەرامۆشی نەکەن:

زیاتر توڕەبونی منالەکانتان، هاوشانە بۆ گرنگی پێدان!

## پێکەنین

کیژۆڵەیەك هەموو ڕۆژێك بە پێ دەچوو بۆ قوتابخانەو دەگەڕایەوە. ڕۆژێکیان کەش و هەوا لەبار نەبوو ئاسمان هەوریی بوو، کیژۆڵە وەك هەمیشە بە پێ بەرەو قوتابخانە بەڕێ کەوت. دوای نیوەڕۆ کەش و هەوا تێکچوو بوو بە زریان و ڕەشەباو باران، دایکی کیژۆڵە نیگەران بوبوو نەوەك

کچەکەی لە کاتی گەڕانەوەیدا بترسێت یان کارەساتێکی بەسەر بێت. بڕیاریدا بە ماشینەکەی بڕوات بە شوێنیدا، بە بیستنی دەنگی هەورو بروسکەی ئاسمان بەپەلە کەوتە ڕێ، لە نیوەی ڕێگا توشی کچەکەی بوو وەك هەمیشە بە پێ بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە، بەڵام بەهەر هەورە بروسکەیەك ئەو هەڵوەستەیەکی دەکردو پێدەکەنی، ئەم کارەی چەند جارێك دوپاتکردەوە، کاتێ دایکی نزیکی بویەوە، جامی ماشینەکەی دادایەوە لێی پرسی: چی دەکەیت؟ بۆچی هێندە لە ڕێگادا دەوەستیت؟

کیژۆڵە وەڵامیدایەوە: "من هەوڵ دەدەم دەم و چاووم جوان دەرکەوێت، چونکە خودا بەردەوام وێنەم دەگرێت!

خودا هەمیشە دەتانپارێزێت، کاتی ڕوبەڕو بوونەوەی گەردەلولی ژیاننتان وێنەتان دەگرێت، لە گەردەلولی ژیاندا هەرگیز پێکەنین لە بیر مەکەن.

ولیم شکسپیر دەڵێت:

ئەو کەسانەی توانای بزەو پێکەنینان هەیە، بونەوەرێکی نایابترن.

بۆ هەرچیەك خودا پێی بەخشیویت
سوپاسگوزاربە، کەمترین ئاکامی سوپاس
نیعمەتی دروستکردنی خودی تۆیە.
ئەبولقاسمی پایندە"

## سوپاسگوزاربە

ڕۆژێك مەلای مەشهور، بەشاردا دەگەڕاو سوپاسی دەکرد، دۆستو ئاشناکانی لێیان پرسی: "مەلا، ئەم سوپاس کردنەت بۆ چیە؟"

مەلا وتی: "ئەوە چوار ڕۆژە کەرەکەم وونکردووە!"

دۆستەکانی بە واقبونەوە پرسیان: "ئەنجا ئەمە سوپاس کردنی بۆچیە؟"

مەلا وتی: "ئاخر ئەگەر خۆم سواری بومایە ئەوا چوار ڕۆژە بێ سەرو شوێن بووم!"

جاك کانفێلد، دەربارەی سوپاسگوزاری دەڵێت:

ڕەوشتی سوپاسگوزاریتان هەبێت، تاکو ژیانتان پڕ بێت لە نیعمەتەکان....

ئێستا دەزانین، وشەکان وزەی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەم بابەتە لە ئێستادا زانا فیزیکدانەکان لە توێژینەوەکانیاندا سەلماندویانەو گەشتونەتە ئەم ئاکامە... لە نێوان دەستەواژە جیاوازەکاندا ئەو دەستەواژەیەی بە سوپاسگوزاریەوە دەست پێ بکات، بەهێزترینو زۆرترین وزەیان لە خۆ گرتووە.

"گۆتهۆ لسینگ" دەربارەی کامڵترین نزا دەڵێت:

کاملترین نزایەك لای خودا پەسەندە، هەمان سوپاسگوزاریە.

دەروونناسی هاوچەرخ "نیشل واکسا" دەڵێت:

سوپاسگوزاری لە دەرگای خوداوەند، باڵاترین و کاراترین گفتوگۆیە لەگەڵ ئەودا، چونکە بێگومان دەبێت شاهێدی شکۆفەی بەرەکەت و نیعمەتی ژیانی خۆت بیت.

حەزرەتی عەلی دەربارەی سوپاسگوزاری دەڵێت:

نیعمەت... بەسوپاسگوزاری بەردەوامی دەبێت.

گەورە عاریف "نەجمەدین رازی" دەڵێت:

سوپاسی هەر نیعمەتێك دەبێت لەگەڵ ئەو نیعمەتەدا گونجاو بێت.

شوکری نیعمەتی جەستە، لە خزمەتی جەستەدا بێت.

شوکری دڵ، بە ئیمان بێت.

شوکری زمان، بە زیکر بێت.

شوکری ماڵ و سامان، بە بەخشین بێت.

شوکری نیعمەتی گیان، بە خۆشەویستی بێت.

"کاترین پاندەر" دەڵێت: هیچ کاتێ هێزی سوپاسگوزاری بەکەم مەزانن... سوپاسگوزاری نەك تەنها شا کلیلی ژیانە، بەڵکو مەرهەمی ناخۆشیەکانی دنیایە، ئارام و خامۆش لە سبەی تا ئێوارە، لەو ساتەوەختەی چاو هەڵدێنیت تاکو ئەو ساتەوەختەی چاو لێك دەنێیت، سوپاسگوزاربە، بەم شێوەیە، نەك تەنها جەستەی نەخۆش، بەڵکو زەین و پەیوەندی کۆمەلایەتی و تەنانەت باری دارایی خۆت بەرەو باڵا دەبەیت.

## نەریت، یەکەم دۆستی مرۆڤەو پاشان دوژمنی...

"پەندی سکۆتلەندی"

### نەریت

قوتابییەك لە مامۆستاكەی پرسی: "چۆن دەتوانم باشترین ڕەوشی كاركردن لە ژیانمدا جیا بكەمەوە؟

مامۆستا داوای لێكرد مێزێك دروست بكات. كاتێ كاری مێزەكە كۆتایی هات، تەنها دەبوو بزماری ڕووی مێزەكە بكوترێتەوە، مامۆستا هاتە لای قوتابییەكەی، قوتابی هەر بزمارێكی بە سێ لێدانی بەدیقەت دەكوتایەوە، یەكێك لە بزمارەكان جوڵاو قوتابی ناچار بوو چوار جار لێی بدات، لێدانی چوارەم تەختەكەی قڵیشاند.

مامۆستا وتی:" دەستەكانت خوویان گرتووە بە وەشاندنی سێ كەڕەتی چەكوشەكەوە، ئەو كارەی ڕەنگی "خوو" بە خۆیەوە بگرێت، مانای خۆی وون دەكاتو ڕەنگە بەزیانی كارەكە بشكێتەوە."

باشترین ڕەوشی كاركردن ئەمەیە كە:

هەرگیز بوار بەخوو نەریت مەدە فەرمانڕەوا بێت بەسەر جوڵەكانتەوە.

برایان تریسی دەڵێت:

مرۆڤ بە بلیمەتی دێتە دنیاوە، بەڵام بە هۆی نەریتەوە سود لە بەدی هێنانەكانی خۆی نابینێت.

ئێش‌و ئازارەکان کەسانی بەرز
بەرزتر دەکەنەوە، کەسانی ئاسایی
دەخەنە ئاستی بەرزەوە.
"عەلی شەریعەتی"

## سەرچاوە بە

حەکیمێك قوتابیەکانی بۆ گەشت‌و گوزار بردە ناوچەیەکی کوێستان، دوای پیادەڕەویەکی دوورو درێژ، هەموو ماندوو تینو لەلای سەرچاوەك وەستان‌و بریاری پشویاندا. حەکیم هەر یەکەو پەرداخێکی پێدان‌و داوای لێکردن پێش خواردنەوە یەکێك مستێك خوێی تێکەن، قوتابیەکان ئەو کارەیان کرد، بەڵام هیچ کەس نەیتوانی بیخواتەوە چونکە زۆر سوێر بوبوو.

پاشان حەکیم مستێك خوێی کردە کانیەکەوە پێی وتن لێی بخۆنەوە هەموو ئاوی سازگاریان خواردەوە.

حەکیم لێی پرسین: ئایا ئاوی کانیەکە سوێر بوو؟

هەموو وتیان: نەخێر، ئاوێکی خۆش بوو.

حەکیم وتی: ئێش‌و ئازارەکانی دنیا بۆ ئێوە وەکو مستە خوێیەکەیە، نە کەمترە نە زیاتر، ئەمە پەیوەستە بە خودی خۆتانەوە، کە پەرداخی

ئاو بن یان سەرچاوەی کانیەکە تا بتوانن ئێش و ئازارەکان لە خۆتاندا بتوێننەوە، کەواتە هەمیشە هەوڵ بدەن سەرچاوە بن، تاکو بەسەر ئازارەکاندا زاڵ بن.

دەریابە، ئەگەر بەردێکیان تێ خستیت

بەردەکە نوقم بێت، نەك تۆ بشڵەقێیت.

بەندەی ئەو کەسەیت

کە لە بەندی ئەودایت

"خواجە عەبدولاّی ئەنصاریی"

## هەردوکیان هی منە

ڕۆژێك لە ڕۆژان دوو کەس لە سەر پارچە زەویەك شەڕیان بوو.

هەریەکەیان دەیوت هی منە.

عیسا وتی: "زەوی شتێکی دیکە دەڵێت."

وتیان: "چی دەڵێت؟"

وتی: "دەڵێت هەردوکیان هی منە!"

دوو کەس ڕەنجی بێ هوودەو هەوڵی بێسوود دەدەن
یەکێ کۆیکردەوە نەیخوارد ئەویتر فێر بوو کاری پێنەکرد

چرای دوای مردن

درەنگانی شەوێك پیاوێـك لەگـەڵ خزمەتکارەکـەی بـە نێـو باخی خورماکانیـدا دەگـەڕا، پیاوەکـە بـە خزمەتکارەکـەی کـە فانۆسـێکی بەدەستەوە بوو پێی وت: "دوای مردنی من خورمای ئـەو درەختانـەی لە لێواری جۆگاکەن بەسەر ئاوایی سەروودا دابەش بکە."

خزمەتکار وتی: "بەچاوان."

پیاوەکـە وتـی: "خورمـا پێگـەیوەکان بەسـەر هـەژارانی ئاواییەکـەی خۆماندا دابەش بکە."

خزمەتکار وتی: "بەچاوان."

پیاوەکە بەدەم قسەکردنەوە لە تـاریکی شـەودا بەسـەختی هـەنگاوی هەڵدەگرتو چـەند جارێـك خلیسـکاو خـەریك بـوو بکـەوێت، سـەرەنجام بەسەرسامیەوە بە خزمەتکارەکـەی وت: "تـۆ کـە چـرات بـە دەسـتەوەیە بۆچی لەدوای منەوە دەڕۆیت؟ دەبێت تۆ لە پێش منەوە بڕۆیت تاکو بەر پێی خۆم ببینم!"

خزمەتکار پیاوێکی داناو ژیر بوو وتی: "قوربان خەریکم هەمان کاری تۆ دەکەم!"

پیاوەکە بیری لە قسەی خزمەتکارەکەی کردەوە پاشان دەستی هێنا بە شانیدا وتی: "ئافەرین بۆ تۆ وانەیەکی گەورەت فێر کردم!"

گەر گەوهەرێکت لەدەست دەرچوو
لە سایەی کاتدا دەدۆزرێتەوە
گەر کاتت لەدەست دەرچوو
بە هیچ گەوهەرێك ناکڕرێتەوە

"شێخی شیرازی"

## بەڕێوە بردنی کاتو ژیان

ژنەکەی مەلای مەشهور، لەتاو ژانە سك دەتلایەوە، مەلا بریاریدا بچێت بە دوای دکتۆردا، ئەو لە کۆڵان بوو ژنەکەی هاتە بەر دەرگا پێی وت: "ژانە سکەکەم باشتر بوو، پێویست بە دکتۆر ناکات."

مەلا، گوێی بە قسەی ژنەکەی نەدا، چووە لای دکتۆر وتی: "ژنەکەم توشی ژانە سك بوبوو، بەڵام کاتێ ویستم بێم بەدوای تۆدا ئەو وتی باشتر بووە، ئێستا هاتووم پێت بڵێم پێویست ناکات بێیت!"

سەرنج:

زۆربەمان لە ژیاندا بە کارێکەوە خەریکین پێویست بە ئەنجامدانی نیە.

کات، واتا ژیان، واتا تەمەن، کاتێ باس لە بەڕێوەبردنی کات دەکەین مەبەست بەڕێوەبەردنی ژیانە، دەبێت زۆربەی کاتەکانمان لە پێناو ئەنجامدانی کارێکدا خەرج بکەین کە گرنگی زیاتری هەیە.

"پیتەر دراکەر" دەڵێت: هیچ شتێك بێ سوودتر نیە لەوەی کارێکی نا پێویست بە باشترین شێوە ئەنجام بدرێت.

یەکم هەنگاوی ڕێڕەوی سەرکەوتن، شارەزایی تەواوە لە کات یان

زەمەن، لەراستیدا گرنگترین و خۆشەویسترینمان تەمەنە.

"ئارنولد بنت" زاناو دەروونناس دەڵێت:

هەرگیز کاتێکی زیاترمان ناوێ، ئێمە هەمیشە کاتی تەواومان هەیە!

"کاترین پاندەر" دەڵێت:

دوێنێ بوو بە مێژوو، سبەی مەتەڵەو ئەمڕۆ خەڵاتە!

عاریفی گەورە "شێخی بەهایی" دەڵێت:

لە دەستچوونی کات، لای مرۆڤی راستەقینە، دژوارترە لە سپاردنی گیان، چونکە گیان سپاردن دابڕانە لە خەڵکی، لەدەستچوونی کات دابڕانە لە گیان.

برایان تریسی، لە جیاوازی نێوان براوەکان و دۆڕاوەکاندا دەڵێت:

جیاوازی براوەکان و دۆڕاوەکان لەتاقە شتێکدا کورت دەبێتەوە:

جۆری سوود وەرگرتنی بەنرخ و دروست لە کات.

عاریفی گەورە "سوهەیل تستریی" دەڵێت:

کاتەکانی تۆ ئازیزترین شتە... کەواتە بۆ ئازیزترین شتەکان خەریکی بکە!

"ئالن لاکین" ژیان بە هاوکێشی کات دەپێوێت:

کات، واتا ژیان...

شتێك نیە بتوانی بیگۆڕێت، لە کیسدانی کات مانای لە کیسدانی ژیانە. بەڵام زاڵ بوون بەسەر کاتدا، واتا زاڵ بوون بەسەر هەموو ژیاندا.

## دەبێ بە زێڕ بنوسرێ

- گەمژەیی واتا بەها دانان بۆ ئەو شتەی بەهای نیە.
- مرۆڤەکان نابێت بەساڵەکانی تەمەنیان پێوانە بکرێن، بەڵکو دەبێت بەو شادیو چالاکیە پێوانە بکرێن، کەدەیبەخشن بە کەسانیتر.
- ئەگەر هێشتا بڕیارت نەداوە، مانای ئەمەیە دووبارە بڕیارێکت داوە.
- هەندێجار دوژمنی سەرسەختی تۆ هەمان ئەو کەسەیە لە ئاوێنەدا لێت دەڕوانێت.
- بۆ جوڵە پێکردنی دنیا، سەرەتا دەبێت خۆمان بجوڵێنین.
- رواوە نەخوازراوەکان هەمیشە مایەی سەختیو ناخۆشین، بێئاگا لەوەی نیعمەتی فراوانیان تێدا حەشار دراوە.
- توانایی کەسەکان بەو کارانە نیە دەستیان پێکردوە، بەو کارانەیە تەواویان کردووە.
- کاتێ دڵت کێوی ئاگرینە، چۆن چاوەڕوانی گوڵ دەکەیت لە دەستەکانتدا بڕوێت؟
- سەختترین شتێك لە ژیاندا، لە دەستدانی ئەو شتەیە وادەزانیت ڕاستەقینەیە.
- بەر لەوەی هەر کارێك بکەیت دەبێت "کەس"ێك بیت.
- توڕەیی، وەکو هەڵگرتنی پشکۆیە، ئەوەی پێی دەسوتێت خودی خۆتە.
- کاری بچوك لە مەرامی گەورە بەنرخترە.
- گەر دەتەوێ دروێنەی بەختەوەری بکەیت، دەبێت تۆوی شادی

بچێنیت.

- تاکو شانسێك تاقی نەکەیتەوە، شانسێکت نابێت.
- لە گومانەکانی خۆت بە گومانبە.
- جوانترین وێنەکان لە تاریکترین ژوورەکاندا دەردەکەون، کەواتە هەر کاتێك لە بەشێکی تاریکی ژیاندا بویت، وریابە خودا وێنەیەکی جوانی تۆ دەکێشێت.
- لە جیاتی نوسینی کێلی گۆڕەکانتان، کرداری ئێوەیە ناوتان بە زیندویی دەهێڵێتەوە.
- ژیان ساتەکانی هەناسەدان نیە، ئەو ساتانەیە هەناسە گیر دەبێت.
- تا ئەو کاتەی خۆتت پێ پەسەند نەبێت، دنیا پەسەندت ناکات.
- هەر کارێك ئەنجامی دەدەیت، رەنگە دوایین کاری تۆ بێت، بۆیە بە تەواوی کارەکانت ئەنجام بدە.
- کاتێ "من"ی ئێوە دەیەوێ خزمەتی کەسانیتر بکات، ئامانج رازیکردنی "من"ە، نەك خزمەت.
- دان پیانانی ئیمانی هەر کەسێك لەکرداریدا نەك قسەکانی.
- رێگا هەر چەند کورتو درێژ بێت، بەبێ رۆشتن کۆتایی نایەت.
- کاتێ بۆت ناگونجێ بە شانازیەوە بژیت، دەبێت بە شانازیەوە بمریت.
- نەبوونی شتێکی باش، باشترە لە هەبوونی شتێکی خراپ.
- مشتومڕ کردن لەگەڵ گەمژەیەك، ئەوە دەگەیێنێ دوو گەمژە بونیان هەیە.

**ئەو کەسەی متمانەی بە پێداگریی خۆی هەبێت**
**چیتر بەختو ئیقباڵ بونیان نیە.**

**"پەندی ژاپۆنی"**

**پێداگربە**

ماوەیەك لەمەوبەر فیلمێکم بینی بە ناوی"پەرجوی پێداگریی" چەند وانەیەکی بە پێز لەو کچەی فیلمەکەوە وەرگرت کە مایەی سەرنجە لێرەدا باسی بکەم:

"کتی میلەر" لەو تەمەنەی گەنجیەدا باشترین ناوو شۆرەتی هەبوو. توشی ڕوداوی هاتوچۆ بوو. لە ناکاو ئەو کچەی لێوان لێو لە جۆش‌و خرۆش بوو لە جوڵەو چالاکی کەوت، چەند هەفتە لە حاڵەتی بێ هۆشیدا مایەوە، بێ ئەوەی بچوکترین هیوا بۆ چاکبونەوەی هەبێت.

یانزە هەفتە دوای ئەوە بە هۆشدا هاتەوە تاکو لە سەختترین جەنگی ژیانیدا بەشداری بکات، ئەو ڕوداوە چالاکیەکانی مێشکی لە کار خستبوو، وەکو منالێك پێویست بوو خواردن‌و خواردنەوەو قسەکردن‌و ڕۆشتن فێر بکرێت، سەرەنجام کاتێ تواناى تەواوی بۆ گەڕایەوە لەژیان دواکەوت‌و ئەمەش گەلێ بێ هیوای کرد.

هاوڕێکانی بەئاستی خۆیان گەشەیان کردبوو، بەڵام ئەو نەك هەر گەشەی نەکردبوو، ڕۆژی هەنگاوێکیش دوا کەوتبوو. ئەو گەڕابویەوە سەردەمی منالّی، کێشی خۆی لە دەستدابوو، مشتێك ئێسك‌و پروسك بوو نەیدەتوانی تەواو بجولێتەوەو قسە بکات، کاتێك بەراوردی خۆی بە کەسانیتر دەکرد، گەلێك هەستی داماوی بە خۆی دەکرد. هەموو پێش ئەو

کەوتبوون، ڕۆژانی سەخت چاوەڕوانیان دەکرد.

بەڵام "کیتی" حەزی دەکرد بەردەوام بێت لە ڕاکردن، خەونی ئەو ئەمە بوو جارێکیتر مەودای ١٠٠٠٠ مەتر ببڕێت، ئەو تەنانەت نەیدەتوانی هەنگاوێك بڕوات، ئەم ئارەزووەش بۆ ئەو شتێکی مەحاڵ بوو. بەڵام کیتی بڕیاری خۆی دابوو. بە سەختی خۆی خەریك کرد بە ڕاهێنانەوە تاکو خۆی بۆ ئەو ڕاکردنە ١٠٠٠٠ مەتریە ئامادە بکات، ئەو دەیوست بە تێکرای ئەو مەودایە ڕابکات. گەیشتن بە هێڵی کۆتایی بۆ ئەو سەرکەوتنی مەزن بوو.

ڕۆژی پێشبڕکێ هەموو بەشداربوان بە ئاسانی ئەویان بەجێ هێشت و زۆر بەخێرایی لە چاو وونبون، ئەو تاکو تەنیا هەنگاوەکانی هەڵدەگرت، هەموو گیانی دەئێشا، دڵی بە خێرایی لێی دەدا، چەند جارێك کەوت و هەستایەوە. بەڵام هەرکاتێ دەکەوت بە هیوایەکی زیاترەوە هەڵدەسایەوە. ئەو برەوی بە هەوڵەکانی خۆیدا مەیدانی پێشبڕکێی چۆڵ نەکرد، خۆر لەبەرزایی ئاسمانەوە دەدرەوشایەوە، کاتێ کیتی لە هێڵی کۆتایی نزیك بویەوە، خۆر لەکاتی ئاوابوندا بوو، وردە وردە بێ هیوایی شالاوی بۆ هێنا، دەیویست مەیدان چۆڵ بکات، بەڵام لە پڕ چاوی بە هاوڕێکانی کەوت کە هەموو بە یەك دەنگ دەیانوت کیتی ڕاکەو خێراکە. دەیبەیتەوە!

کیتی، هەوڵیداو پێشبڕکێکەی گەیاندە کۆتایی و ئەو بە یەکەم دەرنەچوو، تەنانەت چەند سەعاتێك لەدوای دوایین کەسەوە بوو، بەڵام ئەو براوەیەکی سەرکەوتوی سەربەرز بوو، پەیامنێرەکان لەبەر ئەم کارە

دلێرانەیە خەلاتی گرانبەهایان کرد، ئەو پەی بەو راستیە برد هەرچەن لاوازو بێ توانا بووە، بەلام لاوازی ناتوانێ بەسەریدا زاڵ بێت.

پەیامنێرەکان لێیان پرسی: "ئەگەر کەسێك هەموو تواناکانی بخاتە گەڕ بەلام سەرکەوتوو نەبێت. دەبێت چی بکات؟"

ئەو وتی: "بە بڕوای من سەرکەوتن مانای یەکەم بوون یان باشترین نیە، کاتێ بۆ مسۆگەر کردنی ئامادجێك هەموو تواناکانی خۆت دەخەیتە گەڕ، سەردەکەویت، بە بڕوای من سەرکەوتن واتا هەوڵدانو لە ڕێی گەیشتن بە ئامانج باشترین هەوڵدان. تەنانەت ئەگەر هەوڵو تەقالاکەت لە کەسانیتر زیاترو باشتر نەبێت."

دووبارە لێیان پرسیەوە: "ئەگەر کەسێك توشی کێشەو گرفتەکان بوو دەبێت چی بکات؟"

ئەو وتی: "هەوڵ بداتو لە مەیدانی هەوڵەکانیدا وەکو کێو مەحکەم بێت. بۆ یەکلایی کردنەوەی گرفتەکانو مسۆگەر کردنی ئامانج، دەست بخاتە هەموو خاكو خاشاکێکەوە، بەلام گۆشە نشین نەبێت، خودا هەمیشە لەگەڵماندایە، ئەو لە هەموو جێیەکە، هەرکاتێ ویستی هەبوو سەرکەوتنمان پێ دەبەخشێت."

سەرنج:

بەری هەوڵو کۆشش، تەنها کاتێ بەتەواوی دێتە بەرهەم کە کۆشیار تاکو دوا مەنزڵ لە هەوڵدان نەکشێتەوە، لەم دنیایەدا هیچ شتێك جێگەی پێداگرییو بەردەوامبوون ناگرێتەوە، نە کارامەیی، نە خوێندنو بڕوانامە، چونکە دنیا پڕ لە کەسانی کارامەو خاوەن بڕوانامەو نەگەشتوون بە هیچ

ئامانجێك. هەركاتێ دڵساردی شاڵاوی بۆ هێنان هەستە دەكەن

هەوڵەكانتان پووچە، ئەم دەستەواژەیە بێننەوە یادی خۆتان:

"لەم دنیایەدا هیچ شتێك جێگەی پێداگریی‌و بەردەوامبون ناگرێتەوە"

"دەتوانم بێگومان سەر دەكەوم"

لەم چیرۆكە رامێنن:

لە مشتومڕێكدا... بەڕیوەبەرێكی فرۆشی كۆمپانیایەك پرسیاری لە

هەزاران فرۆشیار كرد:

"تۆماس ئەدیسۆن، لە هەوڵەكانی كشایەوە؟"

"فرۆشیارەكان: "نەخێر".

براكانی رایت، دەستیان لە هەوڵەكانیان كێشایەوە؟

نەخێر!

كریستۆڤ كۆلۆمب، دەستی لە هەوڵەكانی كێشایەوە؟

نەخێر!

بەڕێوەبەری فرۆش چوارەمین جار هاواری كرد:

گری باتلر، هەرگیز چۆكی دادا؟

ماوەیەك بێدەنگی باڵی كێشا، پاشان فرۆشیارێك پرسی:

گری باتلر كێیە؟ كەس تا ئێستا ناوی نەبیستووە!

بەڕێوەبەری فرۆش وتی: دیارە كە ئەو ناناسن، چونكە دەستی لە

هەوڵەكانی كێشایەوە.

لیۆنارد داڤینشی دەڵێ: دژواریەكان ناتوانن شكستم پێ بێنن، هەر گرفتێك

لەبەرامبەر ئیرادەی مندا چۆك دادەدات.

مارێت میکر ستیف دەڵێت: لە ژیاندا هەرگیز چۆک دا مەدە، چونکە مەلکەکانو داکەکان لە کاتو شوێنی خۆیاندا دەگەڕێنەوە.

## ژیان

هەندێجار هەر وا ئاسان نیە بزانی چی دەکەیت

چ بریارێك بدەی، یان چی بکەی، ژیان ڕشتەیەکە

لە ئاسۆی نوێ، ئارەزوی نوێ، ڕۆژی نوێ

ئەو گۆڕانکاریەی بەرەو تۆ دێت هەندێجار

ڕویەڕو بونەوەیان بەدەر نیە لە هاوکاری

بزانە، سەرەتا لە خەیاڵو پاشان بیکە بە ڕاستی

بزانە چەند بە تەنیایت گەشبینبە،

ئەوە دیدگای خۆتە کاری لێ دەوەشێتەوە

هەر ڕۆژەو هەنگاوێك هەڵگرە، دەستبەکار بە.

باوەڕ بکەو تێکرای ئەو بەهایەی شایستەی تۆیە

بە خۆتی ڕەوا ببینە.

پەرواز بکە... هیچ ترۆپکێ نیە تەسلیمی

هەنگاوەکانی تۆ نەبێت... ئاسانە، ئاسان...

هەوڵ بدە تا دەتوانی، دەبینی هەموو شتێك بۆ تۆ بەردەستە.

"کالین میك کارت"

ژیان گرێیەك نیە بەدوایدا بگەڕێین، ژیان راستیەکە دەبێ ئەزمون بکرێت. "سوزان کی گارد"

ئەی دڵ لەبەندی زولفیدا لە پەرێشانیدا مەنالێنە
مەلی زیرەك كە دەكەوێتە داو بەرگەی داو دەگرێ
"خواجە حافزی شیرازی"

**نا هێشتا زووە...**

باپیرەو داپیرەیەك دەچنە فرۆشگایەكەوە، دەیانەوێ دیاریەكی لەدایكبوون بۆ نەوەكەیان بكڕن. لە پڕ داپیرە چاوی بە فنجانێكی جوان دەكەوێ بە باپیرە دەڵێت: "سەیركە، چەند فنجانێكی جوانە!" باپیرە فنجانەكە هەڵدەگرێتو دەڵێت: "راست دەكەیت، ئەمە جوانترین ئەو شتەیە لە ژیانمدا دیبێتم." لەم ساتەدا ڕوداوێكی سەیر ڕوو دەدات. فنجانەكە دەكەوێتە قسەكردن پێیان دەڵێت: "سوپاستان دەكەم، بەلام من هەمیشە هێندە جوان نەبووم." باپیرەو داپیرە بەسەر سامیەوە دەڵێن: "مەبەستت چیە دەڵێی هێندە جوان نەبووم؟"

فنجان دەڵێت: "من پێش ئەمە گڵێكی نەرمو شێدار بووم، تاكو رۆژێك ژنێك هەڵیگرتمو بردمیە لای چەرخی گۆزەگەریەكو هێندە سوڕاندمیەوە نەمدەتوانی بەر پێی خۆم ببینم بۆیە هاوارم كرد: بەسە ئیتر بیوەستێنە. بەلام ئەو ژنە نەیوەستاندەوە وتی هێشتا زووە، سەرەنجام چەرخەكەی وەستاند، بەلام دواتر كارێكی پێكردم سەد ڕەحمەت لە كاری یەكەمجار، كردمیە كورەیەكەوە هێندە سوری كردمەوە چیتر بڕستم لێ بڕا، هاوارم كرد بەسە ئیتر: "سوتام سوتام"، بەلام ئەو وتی: "نا هێشتا زووە."

سەرەنجام دەری هێنامو دامیە دەست ژنێكی كورتە باڵا، تاكو ڕەنگم بكات، ئەو دوكەڵو بۆنە ناخۆشەی ڕەنگەكان لە هۆشیان بردم.

بە پارانەوە هاوارم کرد: "بەسە ئیتر لێمگەڕێن."

بەڵام ژنە کورتە باڵاکە وتی: "نا هێشتا زووە."

سەرەنجام رەهایان کردم، بەڵام دوبارە خرامەوە شوێنی یەکەمجارم، مەبەستم کوورەکەیە، ئەمجارە کوورە لە جاری پێشوو گەرمتر بوو، دوبارە هاوارم کردەوە، لێرە دەرمبێنن، لێرە دەرمبێنن!

ئەو ژنەی لەوێ وەستا بوو، سەیرێکی ناو کوورەکەی کردو وتی: "نا هێشتا زووە." سەرەنجام لەو کوورەیە دەریان هێنام‌و دایاننام تاکو سارد بوومەوە، کاتێ تەواو سارد بوومەوە، لاوێک لەگەڵ پوش‌و فنجانی دیکەدا کردمیە پاکەتەوە، پاشان ژنێک دەری هێنام‌و خستمیە سەر رەفەی کەنار ئاوێنەیەك، کاتێ لە ئاوێنەدا خۆمم بینی، زۆری نەمابوو لە خۆشیدا شاگەشکە بم، ئەوەی دەمبینی باوەڕم پێنەدەکرد، من چیتر ناشیرین‌و شێدار نەبووم، ئاخر نازانن لە خۆشیدا چەندە گریام، تەنها لەو کاتەدا بوو دەرکم کرد ئەو هەموو ئێش‌و ئازارو ناڕەحەتیە بەهای خۆی هەبوو، لەو کاتەدا بوو ئەوانە مانای راستەقینەیان پێ بەخشیم، ئێستا ئەو ئازارو ناڕەحەتیانە تێپەڕین، بەڵام بەرەنجامی جوانیەکەیان هێشتا لە مندا ماوەتەوە!

"ژرار کلین" دەڵێت: هەر جوڵەیەکی بەرەو پێش‌و هەر سەرکەوتنێکی نوێ، لەدایکبونێکی نوێیەو هەموو لەدایکبونێك بەئێش‌و ئازارێکی سەختەوەیە.

**گرفتەکان دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەرەخسێنن**

**تاکو بتوانین جەوهەری وجودی خۆمان بدۆزینەوە.**

هەڵە کردن کارێکی ئاساییە، بەڵام
دوبارە کردنەوەی کارێکی نامرۆڤانەیە
"لوییز هی"

**هەڵە**

برایانو رۆب، ئارەزوویەکی سەیریان لە راوو شکاردا هەبوو، ئەوان لە هەفتەیەکدا لە دارستانە دورەکانی کەنەدا چەند گەڤەزنێکی گەورەیان ڕاو کرد، کاتێ فرۆکەوانەکەیان هاتەوە بەدوایانـدا بەنیگەرانیـەوە وتـی: "مـن نـاتوانم بـەم نێچـیرە قورسـەوە ئێـوە هـەلگرم، باڵەفڕەکـەی مـن توانـای هەلگرتنی ئەم بارە قورسەی نیە."

برایان وتی: "بەڵام ئەو باڵەفڕەی پارساڵ ئێمەی هەڵگرت دروست هەر وەك ئەمەی تۆ بوو."

کابرا وتی: "بەراست، ئەگەر پار ساڵ وابوبێت کەواتە ئەمسـاڵ منـیش دەتوانم."

باڵەفڕەکە کەوتە جوڵە، بەڵام بـەم بـارە گرانـەوە بـە سـەختی تـوانی بەسەر ئەو دارستانەدا بفرێت، دوای بڕینی مەودایەکی کەم، خۆی کێشا بە قەدپاڵێکداو کەوتنە خوارەوە. سەرنشینەکان هەرچۆنێك بوو بەسەلامەتی خۆیان بەردایەوە، لەم کاتەدا رۆب، پرسی: "ئێمە لە کوێین؟"

برایان سەیرێکی دەورووبەری کرد وتی: "دڵنیا نیم، بـەڵام بـە گومـانی من نزیکەی کیلۆمەترێك پێشتر لە پارساڵ!"

دەروونناسی ناودار "ئوپێرا وینفری" دەڵێت:

لە ژیانی مندا هەڵە بوونی نیە، نامەوێ بڵێم وەکو فریشتەی ئاسمان بووم، بەڵام بەراستی هەڵە نەبووە، بەڵکو وانەی سەرسوڕ هێنەر بووە.

جوزیف مۆرفی دەڵێت:

تاکو هەڵە نەکەیت هەرگیز فێر نابیت،

بەڵام فەرامۆشی نەکەیت

هەندێ لە هەڵەکان تەمەنی مرۆڤ وێران دەکەن!

لەهەڵەکانی خۆت بێزار مەبە...

کاڵو کرچی پێویستیی ژیانەو ژیان گەشەی پێ دەکات، هەرچیەکت دەوێ بەهەڵە بیکە... بەڵام وریابە دووجار هەڵەیەکە دوپات مەکەرەوە...

نەخۆش، کەسێك نیە کەمئەندام بێت،
کەمئەندام ئەو کەسەیە،
خۆی دەکاتە قوربانی
بارودۆخی ژیان.

کەمئەندام

مرۆڤی کەمئەندام ئەو کەسەیە لاوازی فیکری هەیە، ئەو کەسەیە ئەندێشەو خەیاڵەکانی بەندی بیر کردنەوەی نەرێنیە. کەمئەندام کەسێکی نابینا نیە، ئەو کەسەیە چاوەکانی لە ئاست دەرفەتو نیعمەتەکاندا نوقاوە. نەبیست نیە، بەڵکو توانای بیستنو هەست پێکردنی مۆسیقاو جوانیی ژیانو نەوای فریشتەکانی نیە.

مرۆڤی کەمئەندام کەسێك نیە دەستو قاچی نەبێت، بەڵکو کەسێکی نا بەرپرسو دەستو پێ بەستراوو خاوەن ئەندێشەیەك نیە بۆ یەکلایی کردنەوەی گرفتەکانی ژیان.

سەرەنجام مرۆڤی کەمئەندام کەسێك نیە نەتوانێ بدوێت، بەڵکو کەسێکی لاسایی کەرەوەیەو متمانەی تەواوو هێزی دەربڕینی ڕاو بۆچونی خۆی نیە، بژاردەو تواناو هێزی بەدەستی کەسانیترەوەیە تاکو لە جیاتی ئەو بیر بکەنەوەو بڕیار بدەن.

یەك وێنای زەین،

بەهای لە هەزاران وشە زیاترە

"جی پی ڤاسوانی"

## هێزی وێنای زەین

"جیمز نسمت" هەمیشە خەونی سەرکەوتویی لە یاری گۆڵفدا دەپەروەراند، سەرەنجام توانی بە ڕەوشێکی تایبەت ئەم خەونەی بەدی بێنێ، ئەو ماوەیەکی زۆر یاریزانێکی ناوەند بوو، پاشان بۆ ماوەی حەوت ساڵ وازی لە یاری گۆڵف هێنا، بەڵام لە راستیدا هەر لە ماوەی ئەم حەوت ساڵەدا بوو لەڕەوشە تایبەتەکەی خۆیدا چڕ بویەوە. دوای ئەم ماوەیە ریکۆردێکی سەرسوڕ هێنەری تۆمار کرد. نهێنی سەرکەوتنەکەی چی بوو؟ "وێنەسازیی زەینی".

ماوەی ئەو حەوت ساڵە لە ڤێتنامدا ئەو دیل بوو، لە قەفەزێکدا بەرزایەکەی ١/٥ و درێژیەکەی ١/٥ بوو. تەواوی ئەم ماوەیە کەسی نەبینیو قسەی لەگەڵ کەسدا نەکردو هیچ چالاکیەکی جەستەیی نەبوو، ئەو لەسەرەتای مانگەکانی دیل بوونەوە بێجگە لە نزاو پارانەوە بۆ ئازادبوون هیچی دیکەی نەکرد، گەشتە ئەو ئاکامەی ئەگەر بۆ خەریکردنی زەینی خۆی ڕێیەك نەدۆزێتەوە بێگومان شێت دەبێت. ئەو لە زەینی خۆیدا

زەوییەکی بۆ یاریکردنی گۆڵف دیاریکردو دەستی کردە یاری کردن، هەموو رۆژێك یاریەکی تەواوی هەژدە قۆناغی لە خەیاڵی خۆیدا تەواو دەکرد، هەموو شتێکی بە خەیاڵ وێنا دەکرد، خۆی دەبینی جلی تایبەتی یاریی گۆڵفی لەبەردایە. بۆنی خۆشی درەختو چیمەنی تازەی دەکرد، رۆژەکانی بەهار، رۆژانی ساردی زستان، رۆژە گەرمەکانی هاوینی لە ناخیدا بەرجەستە دەکردو هەموو ئەم شتانەی دەکردە هەقیقەتی رەها، ئەو گرتنی داری گۆڵفەکەی لە نێو مشتەکانی خۆیدا هەست پێ دەکردو بەخەیاڵەوە دەیوەشاند، هەمیشە خۆی تاقی دەکردەوە، جوڵەی هیلالی شێوەی تۆپەکەی لە ئاسمانی خەیاڵیداو هاتنە خوارەوەی لە شوێنی مەبەست بە چاو دەبینی، تێکرای ئەمانە لە زەینیدا شەقڵیان دەگرت.

لە دنیای واقیعی ئەودا رۆشتن نەبوو، شوێنێك نەبوو، بەلام ئەو لە خەیاڵی خۆیدا دەرۆشت، ئەتوت بەراستی لە مەیدانی گۆڵفدا هەنگاو هەڵدەگرێت، یەك خولی تەواو یاریکردن لە خەیاڵی ئەودا بە ئەندازەی یاریەکی راستەقینە درێژەی هەبوو. حەوت رۆژ لە هەفتەیەکدا، چوار سەعات لە رۆژێکدا، هەژدە قۆناغی تەواو، سەیر نیە دوای حەوت ساڵ ئەو توانی بیست لێدان لە ریکۆردی ناوەند پشگیریی بکات!

ویلیم جیمز دەڵێت: هەر وێنەیەك لە خەیاڵی خۆتدا بەرجەستە بکەیت، ئەوا هەستە ناخت راستەقینەی پێ دەبەخشێت.

ئەنیشتاین دەڵێت: خەیاڵ کردن پێشبینی نایابیەکانی ئایندەیە.

لۆژیك لە(ا) دەتانبات بۆ (ب) هاوکات خەیاڵ دەتانبات بۆ هەموو جێیەك.

**خراپە مەکە لەم مەزرای زوو گوزەرەدا**
**بەداسی رۆژگار هەمان ئەوە درویێنە دەکەیت**
**کە چاندوتە.**

**وەفاداریی**

حەکیمێك ژنێکی زمان درێژو ناسازگاری هەبوو، خراپی ئەم ژنە لە هەموو جێیەك دەنگی دابویەوە. رۆژی یەکێك لە هاورێکانی پرسیاری لێکرد: "هاوسەرەکەت چۆنە؟"

حەکیم وتی: "سوپاسی خوا دەکەم."

سالآنێك دوای ئەوە لەیەکتر جیا بوونەوە، ژنەکە شوویکرد بە پیاوێکی بازرگان.

رۆژێکیان، هاورێکانی حەکیمەکە پرسیاریان لێکرد: "ئێستا کە لێت جیابۆتەوە پێمان بڵێ چۆن ژنێك بوو؟"

حەکیم وتی: "ئەو کاتە کە ژنم بوو لێتان پرسیم، پابەندبووم بە وەفاداریو حورمەتی خۆمەوە. ئێستا ئەو حەرەمی کەسێکی دیکەیە کەواتە پابەندبوون بەوەفاداریو حورمەتەوە دوو بەرامبەرە، چۆن بتوانم پەردەی حورمەتی کەسێکی دیکە هەڵبدەمەوە؟ فەرامۆشی نەکەن: حورمەتی بەندەکانی خودا بپارێزن، تاکو خودا حورمەتی ئێوە بپارێزێت."

هاوڕێکانی بەگاڵتە پێکردنەوە لێیان پرسی: "خودا چۆن حورمەتی ئێمە دەپارێزێت؟"

حەکیم وتی: "بێگومان هەموتان تا ئێستا گوناهتان کردووە، وایە؟"

هاوڕێکانی وتیان: "بەڵێ."

حەکیم وتی: "ئێستا وایدانێن یەکێك لە لایەن خوداوە بێتو لەم کۆمەڵەدا یەك بەیەکی گوناهەکانتان کە لە تەنیاییدا ئەنجامتان داوە هەژماری بکات، ئێوە چ حاڵێکتان دەبێت؟"

هاوڕێکانی سەریان داخست!

حەکیم وتی: "کەواتە حورمەتی یەکتریی بپارێزن، چونکە شکاندنی حورمەت ئاکامێکی سەختی هەیە، کەمترینی دەرکەوتنی کارێکی ناشیرینە لەم دنیایەدا، کەواتە تاکو دەتوانن کاری چاکە بکەن، چونکە جیهان پایەدار نیە!"

باشترینتان ئەو کەسەیە، حورمەتی کەسێك لە پاشەملە دەپارێزێت.

لە لقی تەمەنمان چەند گوڵی
دەرفەت پشکوتوو هەڵوەریی
سەد ئافەرین بۆ هیمەتی
ئەو کەسەی گوڵی چنیو رۆشت

## دەرفەتەکان مەفەوتێنن

لـە چـین، چـیرۆکێکی کـۆن پەیوەسـتە بـە پیاوێکـەوە کـە شـەوێك فریشتیەیەك دەچێت بۆ لایو پێی دەڵێت بەم زوانە چـەند پـێش هـاتێکی خۆش لـە ژیانیـدا چـاوەڕوانی دەکـاتو دەبێتـە خـاوەنی نـاوو شـۆرەتو سەروەتو سامانێکی فراوانو ژنێکی جوان، ئەم پیاوە هەموو تەمـەنی لـە چاوەڕوانی رودانی ئەو پەرجوەدا بـوو، بـەڵام هـیچ شـتێك لەوانـە ڕوینـەدا سەرەنجام هەروا بەو داخەوە لە دنیا دەرچوو، کاتی گەشتە دەروازەکـانی بەهەشت، هەمان ئەو فریشتەیەی دیتەوە کە سـاڵانێك پێشـتر هـاتبوو بـۆ لای، پیاوەکە گلەیی لێکردو وتـی: "تۆ بەڵێنی سەروەتێکی فراوانت پێدامو پێشـبینی پلـەو پێگەیـەکی بـاڵات بـۆ کـردمو پێـت وتم ژنێکـی زۆر جـوان دەبێتە نسیبم، بەڵام من تەواوی تەمەنم لە چاوەڕوانیدا بوومو هیچ شـتێك لەمانەم نەبینی."

فریشتە وتی: "من هەرگیز بەڵێنی ئەوانەم پێنەداویت، من ئەو کاتانەم پێ وتیت کەدەگەیتە سەروەتو کاتی پێگەی کۆمەڵایـەتی بونـە خـاوەنی

هاوسەرێکی جوانم نیشاندایت، بەڵام بەداخەوە تۆ بوارت ڕەخساند ئەم کاتانە یەك بە یەك بەلاتدا تێپەڕ بین‌و لە ناو بچن.

پیاوەکە گێژ بوبوو وتی: "لە مەبەستەکەت تێناگەم!"

فریشتەکە وتی: "لە بیرتە کاتێك بیرت لە بازرگانی دەکردەوە، بەڵام لەترساندا نەتوێرا دەستبەکار بیت؟" پیرەمێرد سەرێکی لەقاند، فریشتەکە وتی: "کە تۆ نەتویست بەرنامەی بازرگانی بخەیتە گەڕ، هەمان ئەو بیرو خەیاڵە چووە مێشکی پیاوێکی دیکەو بەڵام ئەو پیاوە بە پێچەوانەی تۆوە بواری نەدا هیچ بیرو ئەندێشەیەکی ترسێنەر پەشیمانی بکاتەوە، خۆیشت دەزانی ئەو لە ماوەیەکی کەمدا بویە یەکێك لە پیاوە سەرمایەدارەکان." فریشتە پاش کەمێك وتی: "ئەو کاتەت لە بیرە زەمین لەرزەیەکی بەهێز شارەکەی تۆی لەرزاندو هەموو کۆشك‌و تەلارەکانی ئەو شارەی روخاندو هەزاران کەس لە ژێر دارو پەردودا گیریان خوارد، بەڵام تۆ نەتوێرا ماڵەکەی خۆت بەجێ بێڵیت‌و بچیت بەهانای لێقەوماوەکانەوە لە ترسی ئەوەی ئەگەر ماڵەکەت چۆڵ بکەیت تالان دەکرێت، بۆیە خواستی کۆمەکت لەبەرچاو نەگرت‌و پێتباش بوو لە ماڵەوە بمێنیتەوە، پیاوەکە سەری بە نیشانەی بیرکەوتنە لە قاندو شەرمەزاری ئەو سەردەمەی کەوتەوە یاد. فریشتە وتی: "ئەو روداوە گەورەترین پێگە بود بۆ رزگارکردنی گیانی ئەو کەسانەی گیریان خواردبوو، ئەگەر ئەو کارەت بکردبا لەلایەن تێکرای ئەو کەسانەوە مایەی ناوبانگ‌و شۆرەتێکی کۆمەڵایەتی دەبویت، پاشان لە بیرتە لە دنیادا ژنێکی زۆر جوانت لێ هەڵکەوت، ژنێك کەتۆ بێ ئەندازە شەیدای بوبویت، لەو سەردەمەدا تۆ وا

بیرت دەکردەوە ئەو ژنە هەرگیز ئامادە نیە هاوسەرگیریت لەگەڵ بکات، لەترسی ئەوەی وەڵامی نەخێر وەرنەگریت لێی کشایتەوە؟" پیاوەکە دیسان سەری بە نیشانەی ئەریّ لە قاندەوە، فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتنە خوارەوە. فریشتە وتی: "بەڵێ... هاوڕێم ئەو دەیتوانی ببێتە هاوسەرتو لە گەڵ ئەودا ببیتە خاوەنی منداڵو ژیانێکی نایابی هاوسەرداریتان هەبێت..."

هەموو رۆژێك خودا لەگەڵ تیشکی خۆردا ساتێکمان پێدەبەخشێت کە تێیدا ئەگەری ئەوە هەیە هەرچی بەدبەختیەکانمانە بگۆڕێت، بەڵام رۆژانە ئێمە وا نیشانی دەدەین ئاگامان لەو ساتە نیە، وا دەزانین ئەمڕۆ وەکو دوێنێو وەکو سبەینێیە. بەڵام ئەو کەسەی ئاگای لەو رۆژەیە تێیدا دەژی، ئەو ساتە ئەفسوناویە دەدۆزێتەوە، ئەو ساتەی تێیدا هێزی ئەستێرەکان کارمان تێدەکات تاکو بگۆڕێین، دەمان بزوێنێ تاکو بە دوای خەونەکانماندا بگەڕێین، بەدبەخت کەسێکە لە سەرەڕۆیی دەترسێت، کەسی بوێر نائومێد نابێت وەکو کەسێك دەژی بەدوای خەونەکانیدا بگەڕێت، کاتێك ئاوڕ لە رابوردوو دەداتەوە، چونکە هەمیشە دەگەینە شوێنێك ئاوڕ لەڕابردوو و بدەینەوە، دڵی پێی دەڵێت: "لەگەڵ ئەو پەرجوانەی خودا لە ڕێی تۆدا دایینابوو چیت کرد؟ ئەوانەت لە گۆڕنان؟ چونکە ترسی ئەوەت هەبوو لەدەستیان بدەیت؟ ئێستا ئەوەی بۆت ماوەتەوە ئەمەیە دڵنیایت لەوەی ژیانت لەدەستتداوە؟" داماو کەسێکە ئەم قسانەی دڵی ببیستێت، ئەو کاتە باوەڕ بە پەرجو دەکات، بەڵام ساتە جادوییەکان چیتر ئەویان بەجێ هێشتووە.

**حەکیمێك دەڵێت؛**

دەرفەتـەکان بـە خێرایـی لەدەسـت دەردەچـن، زۆر بـە درەنگ دەست دەکەونەوە.

**لەم گفتوگۆیەی نێوان شەیتان و فریشتە ڕامێنن:**

**فریشـتە لـە شـەیتانی پرسـی: "بـەهێزترین چـەکی تـۆ بـۆ فریـودانی مرۆڤەکان چیە؟"**

**شەیتان وتی: "پێیان دەڵێم ئێستا هەلە!"**

**شەیتان پرسی: "بەهێزترین چەکی تۆ بۆ هیوا بەخشـینی مرۆڤـەکان چیە؟"**

**فریشتە وتی: "پێیان دەڵێم ئێستا هەلە."**

**دەبێت نەهامەتی و گرفتەکان بدۆزینەوە، بە ئەندێشەو پلان بیگۆڕین بۆ دەرفەت...**

**"بیل گیتس"**

**کاتێ گەڵاکانی پاییز لەژێر پێ دەنێیت،**
**فەرامۆشی نەکەیت، ڕۆژێك هەناسەیان**
**پێ بەخشیویت.**

**"جۆن پراك"**

**سندوق**

پیرەمێردێك کە دامەزرێنەری کۆمپانیایەك بوو، ساڵانێك دواتر بە هۆی پیریەوە دەستی لەکار کێشایەوەو کوڕەکەی بەڕێوەبردنی گرتە ئەستۆی.ماڵیان لە ناوچەی لۆس ئەنجلوس بوو، پیرە مێرد دوای مردنی هاوسەرەکەی لەگەڵ کوڕەکەیدا دەژیا، ڕۆژانە کە کوڕەکەی دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، دەیبینی لەسەر کورسیەك پاڵی لێداوەتەوە هەواڵی کۆمپانیا دەپرسێت، بەڵام کوڕەکە لەو گفتوگۆیە وەرز بوبوو، کوڕەکە لە دڵی خۆیدا دەیوت: "بەراستی بێزاری کردوین، مناڵەکانم ناتوانن گوێ لە مۆسیقا بگرن، هاوسەرەکەم لەم حاڵە بێزارە."

چەند ساڵێك تێپەڕی...

کوڕەکە لەم حاڵە ناڕەحەت بوو، ڕۆژێك بڕیارێکی سەیریدا، سندوقە کۆنەکەی باوکی بەهاوکاری یەکێك لە هاوڕێکانی لە ژێر زەمین دەرهێناو بە باوکی وت: "باوکە دەتوانیت بچیتە ئەم سندوقەوە؟ دەمەوێ کەمێك پێکەوە پیاسە بکەین!"

پیرەمێرد بە ناباوەڕیەوە سەیرێکی کوڕەکەی کردو چووە ناو

سـندوقەکەوە، پاشـان کوڕەکـە لەگـەڵ هاوڕێکەیـدا کردیـە سـندوقی ماشـینەکەیەوە بـەرەو شـیوو دۆڵێـك ڕۆشـتن، بـۆ دوایـنجـار دەرگـای سندوقەکەی کردەوە بێئەوەی بیر لە شتێك بکاتـەوە دایخستەوە. بەڵام گـوێی لـە دەنگـی باوکـە پیرەکـەی بـوو، بەسـەر سـامیەوە دەرگـای سـندوقەکەی کـردەوە بینـی بـاوکی بـەڕەنگێکی تێکچـوو دەنگێکـی لەرزۆکەوە دەڵێت: "دوای ئەنجامدانی ئەم کارەت، سندوقەکە بپارێزە!"

کوڕەکەی بە واقبونەوە لە باوکی ڕوانی، باوکی وتی:

چـونکە تـۆ ڕەوش‌و نـەریتێکت زینـدوو کـردەوە دواتـر منداڵـەکانیش هەمان شت بەرامبـەر بـە تـۆ دوپـات دەکەنـەوە، بۆیـە وتم ئـەم سندوقە بپارێزە!

سوزان سیلیس لە وەسفی باوکدا دەڵێت:

باوك ئەو کەسەیە دەیەوێت تۆ بگرێت،

بتپارێزێت، هەڵتدات بە هەوادا،

ئەو کاتەی دەکەویت بە زەویدا،

جلە خۆڵاویەکانت پاك دەکاتەوە.

باوك ئەو کەسەیە:

کاتێ هەڵەیەك دەکەیت، نوێت دەکاتەوە

ئەو دەمەی دڵی لە بێدەنگیدا دەشکێت

ئەو کاتەیە تۆ ئازارێك دەچێژێت.

کاتێ سەرکەوتوو دەبیت،

ئەو لە غروردا دەدرەوشێتەوە.

## ئیمان

دیمەنی ڕاکردنی بە پەلەی نەتەوەی جولەکە بە ڕێبەریی حەزرەتی موسا بێنە بەرچاوی خۆت. نەتەوەی یەهود گەیشتنە دەریای سوورو وەستان، خەڵکی بە نیگەرانیو پەرێشانیەوە سەیری دوای خۆیانیان دەکرد، خودا بەڵێنی رزگاریی پێدان هەموو ئاگایان لێیەو ئیمانیان پێی هەیە. بەڵام لەم ساتەدا هەموو لە کەناری دەریادا وەستاون لەشکرەکەی فیرعەون شوێنیان کەوتوون، حەزرەتی موسا دەستەکانی بەرەو ئاسمان بڵند دەکات بەدەنگی بەرز نزاو پارانەوە لە دەرگای یەزدان دەکات تاکو قەومەکەی بەسەلامەتی رزگاریان ببێت، پاشان بە عەساکەی ئاماژە بۆ دەریاکە دەکات، بەڵام کەس ئاگای لەفەرمانی ئەو نیە سەرەنجام هیچ ڕونادات، لەراستیدا تا ئەو ساتەی یەکەمین کەس یەکەمین هەنگاو بەسەر ئاوەکەدا نەنێت هیچ شتێك ڕوو نادات، تا ئەوەی یەکەم کەس یەکەم هەنگاو دەنێتە سەر ئاوەکە، بەم جوڵە ئاسانە نیشانی دەدات بەراستی متمانەی بە بەڵێنی خودا هەیە، ئەو کاتەی ئەم هەنگاوە بە جورئەتو ئیمانەوە دەنرێت، ئاوی دەریا دەبێتە دوو بەشەوە ڕێگایەك بۆ پەڕینەوەی خەڵکەکە بەنێو دەریادا بەڕەهایی دەکرێتەوە.

جوبران خەلیل دەڵێت:

ئیمان ئەو زنجیرە پتەوەیە گرێمان دەداتەوە بە ئەبەدیەتەوە.

لۆمەی کەسی چاوچنۆك مەکە چونکە

خارو خەس بۆنی گوڵی لێ نایەت

"صائیبی تەبریزیی"

### چاوچنۆکی

ڕۆژێك کەسێکی چاوچنۆك کەوتبووە ڕووبارێکەوە، کۆمەڵێ دەوریان لێدابوو تاکو ڕزگاری بکەن، یەکێك لە هاوڕێکانی ڕایکرد تاکو ڕزگاری بکات، لە ڕۆخی ڕووبارەکە دانیشتو پێی وت: "بێنە دەستت با لە ئاوەکە دەرتبێنم." پیاوەکە لە کاتێکدا سەری نوقمی ئاوەکە بوو پەلەقاژەی دەکرد، دەستی پێ نەدا، کەسێکی دیکە هاتو هەمان پێشنیاری بۆ کرد، بەڵام بێ سوود بوو. مەلای مەشهور کە تازە گەیشتبویە ئەوێ، خۆی گەیاندە ئەو و وتی: "ها دەستی من بگرە با ڕزگارت بکەم." پیاوەکە بەپەلە دەستی دایەو هاتە دەرەوە.

خەڵکەکە پێیان سەیر بوو وتیان: "مەلا ئەمە موعجیزە بوو، ئەو دەستی بەکەس نەدەدا."

مەلا وتی: "ئێوە ئەم پیاوە باش ناناسن، ئەو دەستی بێنەی نیە، دەستی بیگرەی هەیە، گەر بڵێیت دەستم بگرە دەیگرێت، بەڵام گەر بڵێی دەستت بێنە نایدات!"

حەکیمێك دەڵێت:

چاوچنۆك پاسەوانی سەروەتەو لەهەموو نیعمەتەکان بێ بەهرەیە.

## هەمیشە جوانترین وەڵام
## لەجوانترین پرسیارەوەیە
## "کامینگز"

**پرسیار**

"ئیزیدو روبی" فیزیکدانی ناوداری جیهان، لە سەردەمی منداڵیدا چووە ئەمریکاو لە رۆژهەڵاتی ئەمریکا نیشتەجێ بوو، رۆژێک لە دیمانەیەکدا لێیان پرسی وەك منداڵە کۆچەریەك چۆن توانیویەتی ببێتە بەرجەستەترین فیزیکدانی جیهان؟

ئەو وتی: "بەدەست خۆم نەبوو. بەدەست دایکم بوو. ئەو ئارەزوویەکی زۆری تاوتوێ کردنو دۆزینەوەی هەقیقەت هەبوو. هەر رۆژێك لە قوتابخانە دەگەڕامەوە لێی دەپرسیم: بزانم کورەکەم ئەمڕۆ پرسیارێکی دروستو حسابیت لە مامۆستا کرد؟"

**سەرنج:**

ئەگەر ئەو پرسیارانەی هەمیشە وەك خوو پێوە گرتن لەخۆت بپرسیت، گۆڕانێکی بچوکی تێدا بکەیت، گۆڕانێکی بنەڕەتی لە ژیاندا دێتە کایەوە. لە میانەی زانیاریە مرۆڤایەتیەکانەوە، هێزی پرسیار کردن وەکو تیشکی لیزەرە، دەبێت فێربین چۆن ئەم هێزە بۆ ڕەواندنەوەی هەر جۆرە گرفتو ئاستەنگێك بەکار بێنین، یەکەم جیاوازی نێوان کەسانی براوەو کەسانی شکست خواردوو چییە؟

گەلێ سادەیە: کەسانی بڕاوە پرسیاری باشتر لە خۆیان دەکەنو سەرەنجام وەڵامی باشتریش وەردەگرنەوە. کاتێ ئۆتۆمبێل هاتە کایەوە، سەدان کەس دەستیان کرد بە دروستکردنی، بەڵام "هینری فۆرد" لە نێویاندا جیاواز بوو لە خۆی پرسی: "چۆن بتوانم ڕێژەی بەرهەم هێنانی بەرز بکەمەوە؟"

"جان دی ئەلسی" دەڵێت:

کەسی هۆشمەند هەموو وەڵامە ڕاستەکان دەزانێت، کەسی دانا هەموو پرسیارە ڕاستەکان!

لەم چەند بابەتە ڕامێنن:

- لە ئێستادا، لە ژیانی مندا چ شتێك مایەی خۆشحاڵیە؟ چ شتێك من ڕازی دەکات، سەبارەت بەو شتە چ هەستێکم هەیە؟
- چ شتێك لە ژیانمدا مایەی جۆش و خرۆشە، چ لایەنێکی دەمبزوێنێ، چ هەستێکم دەربارەی ئەو شتەی هەیە؟
- لە ئێستادا، لە ژیانمدا شانازی بە چ شتێکەوە دەکەم، چ لایەنێکی مایەی شانازیمەو چ هەستێکم دەربارەی هەیە.
- لە ئێستادا، لە ژیاندا سوپاسگوزاری چ شتێکم؟
- لە ئێستادا، چێژ لە چ شتێك دەبینم، کام لایەنەی چێژ بەخشە، سەبارەت بەو شتە چ هەستێکم هەیە.
- لە ئێستادا، لە ژیانمدا بە چ شتێکەوە پابەندم، کام لایەنەی پابەندی کردووم، چ هەستێکم لەبارەیەوە هەیە.
- چ کەسێکم خۆشدەوێ، چ کەسێك خۆشی دەوێم؟ چ شتێك مایەی

عەشق و خۆشەویستیە؟ سەبارەت بەو شتە چ هەستێکم هەیە.

- ئەمڕۆ چ شتێکم بەخشوە؟ چ هاوکاریەکی کەسانیترم کردووە؟
- ئەمڕۆ چ شتێك فێر بووم، فێری چ کارامەیی و چ دەسکەوتێکم بەدەست هێنا؟
- ئەمڕۆ تاکو چ ئاستێك چۆنێتی ژیانی خۆمم بەرەو باڵا برد؟ چۆن بتوانم ئەزموونەکانی ئەمڕۆی خۆم بکەمە سەرمایەی سبەی؟

لە ئیمامی غەزالیان پرسی:

"چۆن گەشتیتە ئەم پایە بەرزەی زانایی؟"

وتی:

"ئەوەی دەیزانم لە پرسیار لێکردنی هیچ شەرمێکم نەکردووە."

**ئەوەی لە دنیادا هەرگیز قەرەبوی ناگرێتەوە**
**عومری عەزیزە بە دەرفەتی بزانە...**
**"شێخی شیرازی"**

## عومری لە دەستچوو

کەسێك چووە لای بستە فرۆشێك وتی:
"دەکرێ هەموو بستەکانت بە خۆرایی بدەی بەمن؟"
بستە فرۆش بە سەرسوڕمانەوە لێی ڕوانی وەلامی نەدایەوە، دووبارە پێی وت: "دەکرێ کیلۆیەك بستەم بە خۆرایی پێ بدەیت؟"
دوبارە کابرا بێدەنگ بوو.
بۆ جاری سێیەم وتی: "تکا دەکەم چەن دەنکە بستەیەکم بە خۆرایی پێ بدە."
ئەو هێندە جەختی کردەوە، کابرا دەنکە بستەیەکی پێدا.
دیسان وتی: "دەنکێك هیچ نیە، دەنکێکی دیکەم پێ بدە."
بەزۆر دەنکێکی دیکەی وەرگرت و داوای دەنکی سێیەمی کرد.
بستە فرۆش تورە بوو وتی:
"بەمجۆرە دەتەوێ هەمویم لێ وەرگریت؟"
موشتەری وتی: "ڕاستیەکەی ویستم فێری وانەیەکت بکەم، تەمەن و ژیانی ئێمەش بەم جۆرەیە. ئەگەر بڵێم هەموو عومرت بە من بفرۆشە بەهیچ نرخێك قایل نابیت، بەلام ڕۆژەکانی ژیانت بە بێ ئاگایی لە دەستی

دەدەیت، وەختێ بە خۆت دەزانیت هەموو عومرت ڕۆیشتووە."

"بنیامین فرانکلین" دەڵێت:

عومرێکی درێژ ڕەنگە بە ئەندازەی تەولو باش نەبێت، بەڵام ژیانێکی بەسوود بێگومان بەئەندازەی تەولو دوورو درێژە.

کرداری پێش گوفتار نیشانەی گەورەییە
گوفتاری پێش کردار گەمژەییە.
"حەسەنی بەصری"

## وانەیەك لە مامۆستاوە

ڕۆژێـك مامۆسـتایەك بـۆ وتارێـك چـووە گونـدێكی نزیـك خۆیانـەوە. خەڵكێكی زۆر بە شەمەندەفەر ڕویـان كـردە ئـەو گوندە بـۆ گـوێگرتن لـە قسەكانی، لـە نێـو گەشـتیاراندا ئەفسـەرێك لەگـەڵ مامۆسـتا پیـادە بـوو، ئەفسەرەكە فەرمانیـدا بـە باریەرەكـە جانتاكـەی بـۆ هـەڵگرێت، مامۆسـتا بەرەو ئەفسەرەكە ڕۆشتو وتی: "كوڕی خۆم ئەمە بارێكی سووكە، بۆچی خۆت هەڵیناگریت، تاكو شتێك پارەت بۆ بگەڕێتەوە؟"

ئەفسەرەكە وتی:

"من ئەفسەرێكم پلەو پایەم ڕێم پێ نادات جانتاكەی خۆم هەڵگرم."

مامۆستا بزەیەكی كردو وتی:

"كوڕێ خۆم ئاكامی فێربوون، خاكەڕاییە نەك خۆپەرستێ، ئەگەر نـاتوانی ئەم كارە ئاسانە ئەنجام بدەیت، چۆن دەتوانی ئـەم جەسـتەیەت بـەدوای خۆتدا ڕابكێشـیت، ئەگـەر نـەتوانی جانتاكـەت هـەڵبگریت، مـن بەوپـەڕی

حەزەوە بۆت ئەنجام دەدەم."

لەراستیدا ئەم مامۆستایە دروشمێکی سادەی ژیانو بیرۆکەیەکی بەرزی لە کرداردا فێر کرد، لە شوێنی وتاردانەکەدا ئەفسەرەکە دەستی برد بۆ گیرفانی تاکو هەقی هەلگرتنەکە بدات بە مامۆستا. مامۆستا پێکەنی وتی: "کوڕەکەم خزمەتکردنی تۆ پاداشتی منە، من پارەم ناوێت."

مامۆستا ئەمەی وتو چووە هۆلّی وتاردانەکەوە. پاش ماوەیەک کاتی وتاردانەکە هاتە پێشەوە، ئەفسەرەکەش چووە هۆلّەکەوە، بەلاّم لەناکاو تەزویەک بە گیانیدا هات، ئەو کەسەی جانتاکەی بۆ هەلگرتبوو ئێستە وتار دەدات، خەلکە تاجە گولّینە دەکەنە ملی. ئەفسەرەکە هەستی شەرمەزاری دایگرت نیدایەک لەدەرونیەوە پێی وت: "خوێندنو بیرکردنەوەی من لە بەرامبەر بیرکردنەوەی مامۆستا وەکو تنۆکی ئاوە لە چاو دەریایەکدا."

"لاوێتسە دەلّێت":

کەسی دانا بە ووتە خەلکی فێر ناکات،

بەلکو بە کردار فێریان دەکات.

"جوزیف کنراد" دەلّێت:

دەنگی کردارەکانتان بەرزترە لە دەنگی هاوارەکانتان.

لەم چیرۆکەی بایەزیدی بەستامی ڕامێنن:

بایەزیدی بەستامی بە ڕێگەیەکدا دەرۆشت، لاوێک بەدوایەوە بوو، سەری بۆ شێخ دادەنەواندو دەیوت: "سەرم لە بەرپێی گەورەکاندایە."

شێخ خەرقەیەکی لەبەردا بوو، لاوەکە پێی وت: "پارچەیەکم لەو خەرقەیەی خۆت بۆ ببڕە، تاکو بیدورم بە کفنەکەمەوە."

بایەزید وتی: " ئەگەر خەرقەکەی بایەزیدش لەبەر بکەی، سوودی بۆ تۆ نیە تاکو کرداری بایەزید نەکەی."

**ژیان رۆژێکی بەفراویە کە شوێن پێیەکانت دیارە پێوەی، کەواتە ئاگات لە کردارەکانت بێت....**

**بڕیار نیە لە شتێك بترسین لە ژیاندا**

**هەموو شتێك شایانی دەرك کردنە**

**"ماری کوری"**

## ترس

کچی بانگخوازێکی ئاینی لەگەڵ باوکیدا لە دەشتەکانی ئەفریقادا دەژیا. ئەو لە نێوان گەلە شێرو پڵنگدا گەورە بوبوو، سەرنجی دابوو شێرەکان بە پێچەوانەی ئاژەڵەکانی دیکەوە لە گەڵ شێرە پیرەکاندا بە شێوەیەکی جیاواز ڕەفتار دەکەن، لە کاتێکا زۆربەی ئاژەڵە پیرەکان لێیان دەگەڕێن تاکو دەمرن. شێرەکان بەمشێوەیە ڕەفتار ناکەن زیاتر پیرەکان ڕاوو دەکەن. دەستەی شێرەکان بزنە کێویەك لە دۆڵێکی تەسكو باریکدا بەگیر دەهێنن، شێرە گەنجەکان لەلایەكو شێرە پیرەکان بە بێ نینۆكو ددان لە لایەکی دیکەوە کۆ دەبنەوە، شێرە پیرەکان بەوپەری تواناوە بەدەنگی بەرز دەنەڕێنن، ئاژەڵەکانی ناوەوە بەبیستنی نەڕەی شێرەکە بەئاراستەی پێچەوانەوە ڕا دەکەن دەستبەجێ دەکەونە داوی

شێرە گەنجەکانەوە. وانەیەك بزنە کێویەکان فێری دەبن ئاشکرایە، ئەگەر بەرەو دەنگی نەڕەی شێرەکان ڕایان بکردایە پارێزاو بوون، بەڵام ئەوان زۆر ترسا بوون، لەراستیدا بەهەڵاتن لەدەنگە مەترسیدارەکە خۆیان خستە داوی شێرەکانەوە.

ئەوان لە دەنگی نەڕەی شێرەکان هەڵدەهاتن، کەسانی پەرێشان لە ترس هەڵدێن هەوڵ دەدەن شوێنێکی ئارامی بدۆزنەوەو خۆیانی تێدا حەشار بدەن، ئەگەر لە پەرواز بترسن سواری باڵەفڕ نابن، ئەگەر لە قەرەباڵغی بترسن خۆیان لە چوارچێوەی ماڵدا بەند دەکەن، هەرچەن زیاتر هەڵێن زیاتر دەترسن.

"سوزان جیڤرسۆن" دەڵێت:

باوەڕ بە ترس بکەنو بەهەبونی ترسەوە هەنگاو هەڵگرن!

"ئیمانوئێل" دەڵێت:

بزانن لە ژیاندا لە چی دەترسن

بزانن لە خۆتاندا لە چی دەترسن.

بەچاوو دڵی کراوەوە زاڵ بن بەسەر ترسەکەی ناخی خۆتاندا.

دەبینن ترس وەکو ژورێکی بەتاڵە.

ترس تەنها بە ئەندازەی دوربونی ئێوە بەهێزە.

هەرچەن زیاتر لە ترس هەڵێن

لێی دورە پەرێز بن.

نەتانەوێ لە ئامێزی بگرن

هێزێکی زیاتری پێ دەبەخشن...

"دیل کارنگی" لەو باوەڕەدایە:

مرۆڤ هێندەی ترسی لە ڕوداوی بەدی نەهاتوو هەیەو ئازاری پێوە دەچێژێ، هێندە لە ڕودانە راستەقینەکەی ئازار ناچێژێت.

## کرمی خاکی

ڕۆژێکی خۆشی هاوین، کرمێکی خاکی بەلای گژو گیایەکدا دەڕۆشت، ئەو بەتەنیا بوو، هەروا بەدەم ڕۆشتنەوە بیری دەکردەوە: "چی دەبوو ئەگەر هاوسەرێکم هەبوایەو توانیبام لەگەڵ ئەودا بەختەوەر بم."

لەپڕ سەری هەڵبڕیو لەبەرامبەر خۆیدا کرمێکی خاکی زۆر جوانی هاوشێوەی خۆی بینی، لەچاو تروکانێکدا عاشقی بوو، پێی وت: "ئازیزەکەم سەرەنجام تۆم دۆزیەوە، وەرە با پێکەوە پیر ببین." بەڵام کرمەکە پێی وت: "وسبە، من تەنها کلکی خۆتم!"

سەرنج:

خۆمان نیوە ونبوەکەی خۆمانین، سەرچاوەی ئەو عەشقو ئارامیەین کە لە خەڵکی دەخوازین، هەمان ئەو ڕوناکیەین کە دەمانەوێ پێی هەموو دنیا ڕوناک بکەینەوە، هەمان ئەو گەنجینەین کە بەدوایدا دەگەڕێین، هەمان ئەو مەبەستەین بۆ مسۆگەر کردنی هەنگاوی بۆ هەڵدەگرین.

ئەو خزمەتەی بە خەڵکی دەگەیێنین
بەهای مۆڵەتی مانەوەمانە لەسەر زەوی.
"ویلفرد نفیل"

ئالبێرت شوایتزر

ئالبێرت شوایتزر ساڵی ١٨٧٥ لە یەکێك لە گوندەکانی "ئەلزاس" چاوی بە دنیا هەڵهێنا. باوكو دایکی لە بنەماڵەی رۆحانیەکان بوون، ئەو کاتی لەدایکبون منالێکی لاوازو ناتوانا بوو کە هیچ ئومێدێك بە ژیانی نەبوو. دایکیو خزمەکانی هەمیشە بۆ حاڵی ئەو دەگریان، بەلام ئەو بەپێچەوانەی گومانی هەموو لایەکەوە زیندوو بوو. بەوپەڕی چێژەوە گوێی بۆ ئامۆژگاریەکانی باوکی دەگرتو ئارەزووی گەورەی لەسەردا هەبوو، ئەو شەیدای خەیاڵو ئەندێشەی دوورو درێژ بوو. لە سەردەمی لاوێتیدا بەهێز بوو.

ئالبێرت بۆ تێپەڕاندنی خولی سەرەتایی لەلای مامی کە لە شارێکی نزیکی سنور بوو دەژیا، هاندانەکانی ژنی مامی کە منالی نەبوو، بویە هۆی ئەوەی ئالبیرت بە باشی فێری پیانۆ ژەندن بێت. لە قوتابخانە منالێکی زیرەكو متمانە بە خۆی لێ دەرچێت، جۆشو خرۆشی فێربوون لە ناخیدا سەرچاوەی گرت تا ئەو شوێنەی هەرگیز لە خوێندنەوەی کتێب ماندو نەدەبوو. وەك خۆی دەڵێت:

من لە تەمەنی نۆ ساڵیی تاکو تەمەنی چواردە ساڵی کەباشترین

سەردەمی فێر بوونە، لەگەڵ ئەندێشەی داهێنەران و ناودارەکانی جیهان ئاشنا بووم.

لە سەرەتایدا لە مێژوودا وەڵامی هۆشمەندانەو زیرەکانەی ئەو مامۆستاکانی سەرسام کردبوو، سەرەنجام بەو پەڕی سەرکەوتنەوە سەرەتایی تەواو کردو رۆشتە پاریس و لە میانەی فێربونی شێوەکانی ژەندنی ئۆرگ لە زانکۆی ستراسبۆرگ، دەستی کرد بە خوێندنی فەلسەفەو ئیلاهیات، بەڵام لە ژیانی ئەودا هیچ شتێك بەئاسانی سەری نەگرت هیچ سەرکەوتن و بردنەوەیەك بە ئاسانی و بەبێ ڕەنج مسۆگەر نەبوو، سەرکەوتنەکانی لە ژیانی فیکری و زانستی ئەنجامی هەوڵ و تەقالاو ئیرادەی نەپساوەی خۆی بوو، ئەو دوای دەرچونی لە تاقیکردنەوەی ئیلاهیات چووە زانکۆی سوربن و ساڵی ١٨٩٩ لە ستراسبۆرگدا بووە یاریدەدەری شوێنی پیرۆزی ئەوێ، پاشان بەڵێنی بەخۆیدا لە پێناوی خزمەتی نەخۆشەکاندا تەمەنی خەرج بکات، لە ئیلاهیات و فەلسەفەدا دکتۆرای وەرگرت، پاشان بە لێکۆڵینەوە و وانە وتنەوەو نوسین دەستبەکار بوو. پاشان بریاریدا بچێتە ئەفریقا بەهانای برا ڕەش پێستەکانەوە بچێت، هەستی دەکرد ڕێگەیەکی دروستی هەڵبژاردووە، ئەوەی ئەو ئارەزووی دەکرد بەکردار کردنی بنەماکانی ڕەوشت بوو، کاری ئەو وانەبێژانەی کەتەنها بە قسە دەیانکردو هەرگیز کردەوەیان پێ نەدەکرد، ئەوی زۆر دلگران کردبوو.

ئەو دەیویست هاوکاری ڕەش پێستەکان بکات، دەردی ئەوان تیمار بکات، شێوەی باشترین مانەوەو ژیانیان فێر بکات، بۆیە لە تەمەنی سیی

ساڵیدا دەستیکردە خوێندنی بواری پزیشکی، خزم و کەس و کارەکەی دەستیان کردە دژایەتی کردن و لۆمە کردنی. ئەوان بڵاویان کردەوە کە ئالبێرت ئەقڵی لەدەستداوە، لەم میانەیەدا تەنها ژنەکەی پشتیوانی لێدەکردو دەرکی دەکرد، ساڵی ١٩١٣ لەگەڵ ژنەکەی و حەفتا پاکەتی داوو دەرمان و کەرەستەی برین پێچی ئەوروپای زێدی خۆی بەجێ هێشت، بە ئیمانێکی فراوان و مەرامێکی بێگەردەوە سەفەرە گەورەکەی خۆی وەکو پزیشکێك بەرەو سەرزەمینی نەناسراوی کیشوەری ئاسیا دەست پێکرد.

کاتی پەڕینەوە لە ڕوباری ئاگۆ، پزیشکی لاوو هاوسەرە بە وەفاکەی بۆ یەکەمجار، تامی گەرمای سوتێنەرو چزوی مێشولەکانی ئەفریقایان چەشت، سەرەنجام چونە ماڵی خۆیانەوە، ئالبیرت ماڵەکەی بە چرایەکی نەوتیەوە ڕوناك کردەوە، ئەو ماڵەی تەنها دوو ژوری تێدا بوو پڕ لە سیسرك و جالجالۆکەو جانەوەری گەزیدە بوو. بەخێرایی ئەو بەلەمانەی خەڵکی نەخۆش و ڕەش و ڕوتی هەڵگرتبوو ڕویان لەو ماڵە دوو ژوریەی ئەو کرد، ئەو دەبوایە بەخێراتن و پەرستاری بکردنایە، بەڵام چۆن و بە چ کەلو پەلێك.

شوایترز، هەر لە سەرەتاوە زانی کە دەبێت خۆی پێویستیەکانی خۆی دابین بکات، هەندێ لە خێڵەکیەکان توشی جۆرە نەخۆشیەك بوون، ئەو بۆ چارەسەر کردنیان دەبوو لە هەوایەکی ئازاددا چاودێریان بکات، ئەو بەم حاڵەوە لەژێر خۆرەتاوی سوتێنەردا بەبێ هەقدەست کاری دەکرد، هەر ڕۆژێك کەش و هەوا نالەبارو باران بوایە دەبوو بە ناچاری کەلوپەلی

پزیشكی بباتـە هەیوانەكەیـەوە، پێویستی ئـەو خەڵكـە وایكـرد بـیر لـە شوێنێكی گەورەتر بكاتەوە، ئەوەبوو هۆڵێكی گـەورەی كۆنی داڕوخـاوی دۆزیـەوە لەگـەڵ هاوســەرەكەی نۆژەنیـان كـردەوە چـەرپایەكی بـۆ چارەسـەری نەخۆشـەكان تێـدا دانـا. نەخۆشـەكانی بـە نەخۆشـی جـۆراو جۆری وەك مەلاریا، سكچوونو نەخۆشی پێستو هەندێك جۆرە برینێكیـان هەبوو كەس بەرگەی بۆگەنی نەدەگرت. بەمشێوەیە ساڵانێكی دوورو درێژ لـە ئـەفریقا ژیـاو لەگـەڵ خـەڵكی ئـەو ناوچـەیە تێكەڵاویـەكی بـەتینو خزمەتێكی فراوانی كردن، ئەو بەڵێنەی لەسەردەمی لاوێتیـدا بەخۆیـدابوو پابەند بوو پێـوەی. نـاوی لەهـەموو جیهانـدا دەنگـی دایـەوە، بـەڵام ئـەم ناسینە بۆ ئەو هیچ گرنگیەكی نەبوو، ئەو لە ساڵی ١٩٥٣ كاتێك لە ئەفریقا بـوو، خـەڵاتی نـۆبڵی ئاشـتی وەرگـرتو خـەڵاتی جـۆراو جـۆری خزمـەتی مرۆڤایەتی بەدەست هێنا.

دوێنێ شێخ بە چرایەكەوە هەموو شاری تەی كرد

كە لە دێوو درنج مەلولم ئارەزووی مرۆڤ دەكەم.

"مەولانا"

مرۆڤەكان

كەسانی گەورە دەربارەی بیرو باوەڕ دەدوێ.

كەسانی ناوەند دەربارەی ڕووداو دەدوێ.

كەسانی بچوك لە پاشەملە دەدوێ.

كەسانی گەورە خەمی كەسانیتر دەخۆن.

كەسانی ناوەند خەمی خۆیان دەخۆن.

کەسانی بچوک بێ خەمن.

کەسانی گەورە پەی بەگەورەیی کەسانیتر دەبەن.

کەسانی ناوەند بە دوای گەورەیی خۆیاندا دەگەڕێن.

کەسانی بچوک گەورەیی خۆیان لە بچوکردنەوەی کەسانیتردا دەبینن.

کەسانی گەورە بەدوای حیکمەتندا دەگەڕێن.

کەسانی ناوەند بەدوای داناییدا دەگەڕێن.

کەسانی بچوک بەدوای مامەڵەیەکدا دەگەڕێن.

کەسانی گەورە بەدوای پرسیاری بێ وەلامدا دەگەڕێن.

کەسانی ناوەند بەدوای پرسیاری وەلامداردا دەگەڕێن.

کەسانی بچوک وا دەزانن وەلامی هەموو پرسیارێك دەزانن.

کەسانی گەورە بەدوای دروستکردنی پرسەکاندا دەگەڕێن.

کەسانی ناوەند بەدوای یەکلایی کردنەوەی پرسەکاندا دەگەڕێن.

کەسانی بچوک هیچ پرسێکیان نیە.

کەسانی گەورە بێدەنگی بەسەر وتندا هەڵدەبژێرن.

کەسانی ناوەند هەندێجار بێدەنگی بەسەر وتندا هەڵدەبژێرن.

کەسانی بچوک بە زۆر بلێیی دەرفەتی بێدەنگی دەفەوتێنن.

مرۆڤ هەمیشە دەتوانێت زیاتر لەوە بێت کەبیری لێ دەکاتەوە، کارەکانی هەموار بکات، هەمواری بە ئەندێشەو خەیاڵەکانی ببەخشێت بەهیواوە زەوی پاراو بکات.

"تۆبری دوور"

ئەوەی عاشقی دنیایە دەبێت
یان قەناعەت چاوی پڕ بکاتەوە
یان خاکی گۆڕ.
"سەعدی شیرازی"

## عەشق بۆ دنیا

ساڵانێك لەمەوبەر لە وڵاتی یۆنان "شادۆخت"ی جوان دەژیا، ئەو نەك هەر جوان بوو بەڵکو لە تیرەوانی و شکاردا وێنەی نەبوو، هەروەها زۆر بەخێرایی رایدەکرد، لەو وڵاتەدا لەقەبی "شادۆخت"یان پێ دابوو. لەبەر ئەم خەسڵەتانە شازادەیەکی زۆر لەتەواوی دنیاوە خوازبێنیان دەکرد، بەڵام ئەو مەرجی تایبەتی بۆ هەموویان هەبوو، ئەم مەرجە کلیلی هاوسەرگیریی ئەو بوو. مەرجەکەی ئەمە بوو هەر کەسێ بتوانێ لە ڕاکردندا لێی بباتەوە دەبێتە هاوسەری ئەو کەسە. سەدان جەنگاوەری ئازاو سەدان شازادە بۆ ئەو پێشبڕکێیە هاتبونە وڵاتی یۆنان، بەڵام هیچ کەسێك نەیتوانی بوو لێی بباتەوەو هەموو شکستیان خواردبوو.

شازادەیەك عاشقی "شادۆخت" بوو، بەڵام نەیدەزانی لە پێشبڕکێدا چۆن لێی بباتەوە، ئەو بیستبوی لە شارێکدا حەکیمێکی دنیا دیدە دەژی و گەلێك دانایە. ئەوی بانگ هێشتی کۆشك کردو کێشەکەی بۆ حەکیمەکە گێڕایەوە: "گەلێ جەنگاوەر بۆ پێشبڕکێ چوونەتە یۆنان، بەڵام هەموویان بە دۆڕاوی گەڕاونەتەوە، من چۆن بتوانم لێی ببەمەوە، تۆ کە حەکیمێکی

دنیا دیدەیت، چ ڕێچارێکت هەیە؟"

حەکیم وتی: "خەمت نەبێت چەند پارچە زێڕێکی درەوشاوە بکە گیرفانەکانتەوە، کاتێ پێشبڕکێ دەستی پێکرد، لەڕێگەی ئەودا دانە دانە دایبنێ، بێگومان لێی دەبەیتەوە."

شازادە لەم قسەیە سەرسام بوو، بەلام هیچی نەووتو ڕۆشت بۆ یۆنان، ڕۆژی پێشبڕکێ هاتە پێشەوە شازادە ژمارەیەك زێڕی کردە گیرفانیەوەو بەپێی قسەی حەکیمەکە لە ڕێگەی شادوختدا داینا، ئەویش کە ڕایدەکردو زێڕەکانی دەبینی دەوەستاو یەك بە یەکی هەڵدەگرتەوە، ئەمەش وای لێکرد لە ڕاکردنەکەی دوا بکەوێتو شکست بخوات.

"شادۆخت" لەو پێشبڕکێیەدا دۆڕا، چونکە عاشقی زێڕو گەوهەر بوو، شازادە هاوسەرگیریی لەگەڵ کرد لەگەڵ خۆیدا بردیەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، دووبارە حەکیمەکەی بانگ هێشتی کۆشك کردەوە سوپاسی کرد.

حەکیم وتی:

"عەشق بۆ دنیای ماددی هەمیشە مرۆڤ لاواز دەکاتو دەبێت ئاستەنگی گەیشتن بە ئامانجە ڕستەقینەکانی ژیان. شازادە ئەگەر دەتەوێ هەمیشە لە ژیاندا سەرکەوتوو بیت، دەبێت تێکرای پەیوەستیەکانت لە ناو ببەیت، خۆت بۆ خودا یەکلایی بکەیتەوە."

سەرنج:

تەماکاریی وەکو ئاوێکی سوێرە، هەرچەن زیاتر لێی بخۆیتەوە زیاتر تینوو دەبیتەوە.

"سەعید نەفیسی" دەڵێت:

هیچ شتێك وێنەی تەماكاریی مرۆڤ ناكۆتا نیە.

لەم چیرۆكە ڕامێنن:

پیاوێكی هەژار لەگەڵ خێزانەكەیدا لە كوخێكی بچوكی دارستانێكدا دەژیان، ئەو ژیانی هەژارانەی خۆی بە دارفرۆشیی بەڕێ دەكرد.

ڕۆژێك پیاوە هەژارەكە لە دارستانەكەوە دەنگی ناڵەی ئاژەڵێكی بیست، كە لەوە دەچوو پیویستی بە هاوكاری بێت. بەرەو دەنگەكە ڕۆشت، بینی بزنە كێویەكی بچوك لە نێوانی تاشە بەردێكدا شاخەكانی گیر بووە ناتوانێ خۆی دەرباز بكات.

كابرای هەژار وایزانی ئەم بزنە كێویە لە ئاسمانەوە بۆ ئەو هاتووە، چونكە ئەگەر سەری ببڕێت ماوەیەك سكی ماڵو منداڵەكەی پێ تێر دەكات، لەلایەكی دیكەشەوە دڵی نەدەهات بیكوژێت. بۆیە ئازادی كردو لەگەڵ ڕۆشتنی بزنەكەدا لەدواوە لێی ورد دەبویەوە، سەرنجیدا دەنگێك لەگەڵ ئەمدا دەدوێت: "من ڕۆحی ئەو بزنە كێویەم، لەو تەنگانەیە ڕزگارت كرد، من دەمەوێ پاداشتی ئەم كارە چاكەی تۆ بدەمەوە."

پاشان ڕۆحی بزنەكە شاخێكی لە تاشە بەردێك گیر كردو یەكپارچە بۆی بوو بە زێڕ!

پیاوەكە تەنها سەری خۆی دەلەقاند. ڕۆحی بزنەكە وتی: "زۆر باشە ئەگەر بەدڵت نیە ئەو شاخەت بۆ دەكەمە زێڕ!" بزنەكە بە ئاماژەیەكی شاخەكانی شاخەكەی بۆ كردە زێڕ، پیاوەكە دیسان سەری ناڕەزایی بۆ لەقاندەوە. ڕۆحەكە لێی پرسی: "هێشتا كەمە؟ تەنانەت پاشا خاوەنی ئەمە نیە، چی دیكەت دەوێ؟"

پیاوەکە وتی: "من شاخەکانی تۆم دەوێ!"

سەرەنجام لەم چیرۆکە رامێنن:

بە مەلای مەشهوریان وت:

دەتەوێ باوکت بمرێت تاکو تێکرای سەروەتو سامانەکەی بە میرات بۆت بەجێ بمێنێ؟

وتی: "نەخێر، بیکوژن باشترە بۆ ئەوەی سەرباری میراتەکەی خوێن باییش وەربگرم.

کەسی بەدبین بەدەست "با"وە دەناڵێنێت.
کەسی گەشبین چاوەڕوانە هەوا بگۆڕێت.
ڕێبەر چارۆکە هەڵدەکات.

"هلن جاپن"

**شوێنی بەتاڵ**

تاقیکردنەوەی هەڵبژاردنی بەڕێوەبەری بوو، داوا لەبەشداربوان کرا تا لەسەر تەختە ڕەشەکەی شوێنی تاقیکردنەوە هاوکات تەختەکە بەیاداشت پڕکرابویەوە تا ووشەی ڕێبەری بنوسن، کەسی یەکەم بەکەمێك دیقەتەوە توانی شوێنێکی بەتاڵ بدۆزێتەوە وشەی ڕێبەری نوسی، دووەم دیقەتێکی زیاتری ویست تا شوێنێکی بەتاڵی دۆزییەوە بەخەتێکی خۆش و بەدوو زمان نوسی سێهەم لەکاتێکدا چاوی بڕیبویە تەختەکەو بەئارامی چەمییەوە تەختە سڕەکەی هەڵگرت و تەختەکەی پاك کردەوەو ڕۆشت بەڕای ئێوە کام لەو سیانە سەرکەوتوو بوون؟

سەرنج:

کردار یەکێکە لەگرنگترین خەسڵەتی بەڕێوەبردن، بەڕێوەبەرێك لەمبارەیەوە دەڵێت: وردبونەوەو سەیر کردن شتێکەو دیتنی شتێکی دیکەیە، کەلێی ورد دەبینەوە شتێکی دیکەیە.
دەرکی ئەوەی دەیبینین دووبارە شتێکی دیکەیە.
فێربون لەوەی دەرکی پێدەکەین دووبارە شتێکی دیکەیە.
بەڵام کارکردن بەوەی فێری دەبین بەراستی لەهەمووی بەنرخترە.

هەرکات مرۆڤ هەنگاوێك بەرەو خودا هەلگرێت
خودا زیاتر لەژمارەی بەردو زیخەکانی دنیا
بەرەو مرۆڤ هەنگاو دەنێت.

"شاگتی گوین"

خودا چاوەڕوانە

بەیانی ئەمڕۆ کە لەخەو بێدار بویتەوە، لە تۆم ڕوانی‌و هیوادار بووم کە لەگەڵم بدوێیت، تەنیا چەند وشە یان لەبەر ئەو ڕووداوە دڵخۆشکەرەی کە دوێنێ لەژیانتدا رویدا سوپاسی من بکەیت. بەلام تۆ خەریکی خۆ گۆڕین بووی.

کاتێك دەتویست لەماڵ دەربچیت، دەمزانی کە دەتوانی چەند خولەکێك بوەستیت و سلاوم لێ بکەیت، بەلام تۆ زۆر سەرقاڵ بوویت. کاتێك کە پانزە خولەك بێهودە لەسەر کورسی دانیشتبویت‌و قاچەکانت دەلەقاند، وامدەزانی کە دەتەوێت لەگەڵ مندا بدوێیت، بەلام تۆ بەرەو تەلەفزێنەکە رۆشتیت و پەیوەندیت کرد بەیەکێك لەهاوڕێکانتەوە، تاکو باسی شتی پڕوپوچ بکەیت، من بەدرێژایی رۆژ خۆم گرت و سەیری تۆم کرد، بەلام تۆ ئەوەندە سەرقاڵ بوویت کە هیچ شتێکت پێ نەووتم.

کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆ بینیت کە ژمارەیەك لەهاوڕێکانت بەرلە نانخواردن قسە لەگەڵ من دەکەن، بەلام تۆ کارێکی وات نەکرد. هێشتا کات

ماوە و هیوادارم کە تۆ لە ئەنجامدا قسەم لەگەڵ بکەیت، چویتەوە ماڵەوە و لەوە دەچوو کارێکی زۆرت هەبێت دەبێت ئەنجامیان بدەیت، دوای ئەنجامدانی چەند کارێك تەلەفزیۆنت هەڵکرد و کاتێکی زۆرت پێوە کوشت.

هێشتا من بە ئارامەوە چاوەڕێ بووم، دوای خواردنی نانی ئێوارەت قسەم لەگەڵ بکەیت. کاتی خەوتن وامزانی گەلێ ماندویت. دوای وتنی شەو باش، خێرا بەرەو پێخەفەکەت چویت و خەوت لێکەوت. گرنگ نیە، ڕەنگە دەرکت بەوە نەکردبێت کە من هەمیشە لەگەڵ تۆدام.

من، خۆشەویستی خۆم بۆ تۆ دەردەبڕم و هەموو ڕۆژ چاوەڕێم تاکو قسەم لەگەڵدا بکەیت.

گفتوگۆی یەك لایەنە چەند سەختە!

زۆر باشە، تۆ جارێکی دیکە بێدار بویتەوە، منیش جارێکی دیکە بەهۆی عەشقێك کە بۆ تۆ هەمە، چاوەڕێت دەکەم. بەو ئومێدەی کە ئەمڕۆ کەمێك لەکاتی خۆتم پێ بدەیت. هیوای ڕۆژێکی شادت بۆ دەخوازم..

هاوڕێی خۆت، خودا......

**هەندێجار نرخێکی گران دەدەین بەشتێك**

**هاوکات دەتوانین بە خۆرایی بەدەستی بێنین.**

**"ئەنیشتاین"**

**گۆڕینەوە**

ڕۆژێك نوێنەری کۆمپانیایەکی پیشەیی دەچێت بۆ سەردانی یەکێك لەگوند نشینەکان، ئامێرێکی دۆشینی شیری مانگا لەگەڵ خۆیدا دەبات.

پیتەر جوتیارێکی ئەو گوندە بوو بەبیستنی ئەو هەواڵە بەپەلە خۆی گەیاندە نوێنەرەکە، ئەو لە ماڵی دنیا تاقە مانگایەکی شك دەبرد بەخۆشحاڵییەوە بەنوێنەرەکەی ووت: بیرۆکەیەکی تازەم بۆهات، ئەویش ئەمەیە ئەگەر ئەو ئامێرەم پێ بدەیت منیش مانگاکەی خۆمت پێ دەدەم!

**سەرنج:**

زۆر لەو شتانەی ئێمە خاوەنی نین وەك جوانیو سەلامەتی، لە دەستیان دەدەین لە بەهای شتێکدا لەنەبونی بەرامبەرەکەشیدا ئەو شتە هیچ نرخێکی ئەوتۆی نییە...

**ئەنجامی هەڵە**

پیرەمێردێك‌و کوڕەکەی لە داوێنی چیایەك‌و نزیکی ئاواییەك دەژیان، بە شیر فرۆشتن بژێویی خۆیان دابین دەکرد، بەڵام پیرەمێرد هەرجارێك کە شیری دەدۆشی کەمێك ئاوی تێدەکرد پاشان دەیفرۆشت، هەرچەن کوڕەکەی ناڕازی بوو، بەڵام پیرەمێرد کاری خۆی هەر دەکرد.

ساڵان تێپەڕی‌و لە شەوێکی پاییزدا زریانێکی بە هێز هەڵیکردو بارانێکی بەخوڕ باری‌و لافاوێکی زۆر هاتە نێو ماڵی پیرەمێردەوە، پیرەمێرد بێدار بویەوە هاواری کرد: "کوڕەکەم چی بووە؟ ئەمە چیە هاتۆتە ئەم ماڵەوە؟"

کوڕەکە وتی: "باوکە، ئەمە هەمان ئەو ئاوەیە تۆ دەتکردە ناو شیرەکەو ئێستا هاتۆتە ماڵەکەمانەوە!"

"دنیس ڤیتلی" دەڵێت:

ئەگەر جڵەوی هەڵەکانتان نەکەن، ئەوان ئێوە جڵەو دەکەن.

من بەستێن نیم،
شەپۆلم کە دمڕۆم بوونم
هەیە، گەر نەرۆم هیچ نیم
"عەلی شەریعەتی"

خەونی گەورە"

"تری فاکس" وەرزشکارێکی کەنەدی بوو، دوای سەرکەوتنەکانی، زانکۆیەکی بۆ وەرزش دامەزراند...رۆژێك بە هۆی قاچ ئێشەیەکەوە سەردانی پزیشکی کردو زانی توشی شێرپەنجە بووە. پێیان وت بێجگە لە برینەوە هیچ چارەیەکی نیە. ئەو لە تەمەنی بیستو یەك ساڵیدا بوو، دەیتوانی لە نەخۆشخانە بیر لەم شکستە گەورەیە بکاتەوە، دەیتوانی خەمو پەژارەیەکی زۆر لە ئامێز بگرێت، بەڵام ئەو هەموو سەرنجی خۆی لە رستەیەکدا چڕ کردەوە کە رۆژێك لە ڕاهێنەرەکەی خۆی بیستبوی: "تۆ توانای ئەنجامدانی هەموو کارێکت هەیە بەو مەرجەی لە ناخی دڵەوە ئەنجامی بدەیت."

بەلام تری، بڕیاری ڕاکردنیدا، راکردن لەمسەری کەنەداوە تا ئەوسەری، ئامانجو خەونی ئەو کۆ کردنەوەی سەد هەزار دۆلار بۆ دامەزراوەی توێژینەوەی شێرپەنجەی لاوان بوو. کاتێ لە نەخۆشخانە هاتە دەرەوە قاچێکی دەستکردی هەبوو. باوكو دایکی دژی بڕیارەکەی بوون، رۆژی دواتر تری سەردانی ئەنجومەنی شێرپەنجەی کەنەدای کرد، بەلام ئەوانیش پێشوازیان لەبەرنامەکەی نەکرد. بۆ سبەینێ دەستی کرد بە

"ماراسۆنی نومێد" تری فاکس، لە ناوچەی نیوفانلەند دارشەقەکەی بن باڵی خستە زەریاوەو هەر لەوێوە دەستی پێکرد، لەبەر ئەوەی زمانی ئینگلیزی بوو سەرەتا هێندە گوێی پێنەدرا. دوای ۲۲۷ رۆژ ئەو چووە بەشی زمانی ئینگلیزی لە کەنەدا. تا ئەو کاتە زیاتر ۱۸۰۰۰ کیلۆمەتر رایکردبوو، قاچە دەستکردەکەی برینێکی قووڵی لە جەستەیدا دروست کردبوو، بەو حاڵەوە لە ڕاکردن بەردەوام بوو کە خوێن لە قاچی دەچۆڕایەوە، ئەو لەگەڵ سەرۆك وەزیردا چاوپێکەوتنی هەبوو پاڵەوانە ناودارەکان تریبیان لەسەر دەستی خۆیان هەڵدەگرت پارەیەکی زۆریان بۆ کۆ کردەوە.

تری فاکس ماراسۆنەکەی تا شاری "تاندربی" برەو پێداو لەوێدا بوو دوچاری کێشەی هەناسەدان بویەوە، بە فەرمانی پزیشك بەجێما، تری بە پزیشکی وت: "ئەڵێی نازانی من کێم؟ من دەبێت بەردەوام بم لە ڕێگاکەم، سەرەتا باوکم‌و دایکم پێیان وتم کە من بەرگەی ئەم کارە ناگرم، ئەنجومەنی نەخۆشی شێرپەنجە ئەمەیان لێ قەدەغە کردم. بەڵام بڕیاری من کردنی ئەم کارە بوو، دەسەڵاتدارانی دەوڵەتیش ڕێگریان لێکردم، بەڵام من هەر بەردەوام بووم، سەرۆك وەزیران سەرەتا لە هاوکاری کردنم خۆی دزیەوە، بەڵام سەرەنجام بە پشتیوانی ئەو ملیۆنێك دۆلارم کۆ کردەوە، ئێستاش بڕیامداوە دوای دەرچونم لێرە بۆ هەر تاکێکی کەنەدی یەك دۆلار کۆ بکەمەوە، واتا ۱/۲٤ ملیۆن دۆلار.

پاڵەوانی میللی کەنەدا سەرەنجام بە نابەدڵیەوە تەسلیمی جەختکردنەوەی پزیشکانی خۆی بوو لە نەخۆشخانە کەوت. ئەو دوای

ماوەیەکی کەم ماڵئاوایی لە ژیان کرد. بەڵام سەرەنجام کەنەدیەکان ١/٢٤ ملیۆن دۆلاریان بۆ دامەزراوەکەی ئەو کۆ کردەوە.

کەسانێك لەو باوەڕەدان لەبەر هەبوونی گرفتو کێشەکان سەرکەوتوو نابن، تری فاکس نیشانمان دەدات کە تەنانەت لە ناخۆشترینی کاتەکاندا دەتوانرێ دەرفەتی سەرکەوتن بدۆزرێتەوە.

تری فاکس بیانویەکی نەکردە ئامانج، نەیوت: "من زۆر لاوازو داماووم، من کێشەیەکی گەورەم هەیە." بەربەستەکانی شکاندو بوێریی ئەنجامدانی کاری لە خۆیدا بەدی هێنا.

"درال روتر فور" دەڵێت:

ئەوەی دەتوانیت ئەنجامی بدەیت، یان لەخەونی ئەوەدایت ئەنجامی بدەیت، دەستبەکاربەو موعجیزە بەدوای خۆیدا دێنێت.

"رۆبیرت گرین لیف" دەڵێت:

بەبێ خەونو ئاواتێك پێش هاتی گرنگ ڕوو نادات.

بۆ ئەوەی بەراستی کارێکی مەزن ڕوو بدات،

دەبێت خەونێکی گرنگت هەبێت.

"رۆتر فۆرد" دەڵێت:

بۆ سەرکەوتن دەبێت خوازیار بیت،

بۆ خواستن دەبێت بژاردەیەکت هەبێت،

بۆ هەڵبژاردنیش دەبێت هەوڵ بدەیت،

بۆ هەوڵدانیش دەبێت حەزێکی ئاگرین لە ناختدا بڵێسەی هەبێت...

**بێژەرێك دەتوانێت لە یەك خولەكدا ١٢٥ وشە بڵێت**

**بەڵام بیسەرێك دەتوانێت ٤٠٠ وشە ببیستێت و تێبگات**

**"لیۆ بۆسکالیا"**

**کەماڵ**

قوتابیەکەی لە سوقراتی پرسی: "حیکمەتی من چ کاتێ دەگاتە پلەی کەماڵ؟"

سوقرات وتی: "ئەو کاتەی بە ستایش خۆشحاڵ نەبیت و بە لۆمەکردن خەمگین نەبیت."

قوتابی وتی: "ئەمە کەی بۆ من دەست دەدات؟"

وتی: "هەرکاتێ ئەم چوار شتە هاتەدی، دوو گوێ بیسەری حیکمەت بێت و دوو گوێ کەڕ بێت و قسەی بێ هودەی نەفامان نەبیستێت."

گوێیەکانت بۆ بیستنی قسەی باش ڕابێنە، قسەی نەشیاو ئاوێنەی دڵ ژەنگاوی دەکەن...

**مرۆڤ گەر نەتوانێت خۆی بەرەو باڵا ببات**

**بونەوەرێکی لاوازو پووچە.**

**"دانیال"**

دەتوانرێ پێت بوترێ مرۆڤ ئەگەر بتوانی...

ئەگەر بتوانی سەر بەرز دەبیت ئەو کاتە دەروبەرت، هەموو ناکامیەکانی خۆیان دەخەنەوە ئەستۆی تۆو بە خەتابارت دەزانن.

گەر بتوانی پشت بەخۆت ببەستی، ئەو کاتەی هەمووان لێت بەگومانن

لە ڕەفتارەکانیان ئەم بەدگومانیە دەنوێنن.

ئەگەر بتوانی لەسەرخۆ بیتو بەردەوامی پێ بدەیت، دوو ڕوو نەبیتو لە ڕیاباری دوورە پەرێز بیت.

ئەگەر بتوانی خەون ببینیت، بەلام کۆیلەی خەونەکانت نەبیت.

ئەگەر بتوانی خاوەنی ئەندێشە بیت، بەلام تەنها ئەندێشە بە ئامانجی ژیان نەزانیت.

ئەگـەر بتـوانی لەبەرامبـەر سـەرکەوتنو ناکامیـدا، بـێ جیـاوازی بمێنیتەوە.

ئەگەر بتـوانی هـەموو دەسـکەوتەکانی ژیـان کـۆ بکەیتـەوە، لەچاو تروکانێکـدا هـەمووی بـدۆڕێنیو سـەر لـەنوێ دەسـت پـێ بکەیتـەوە، لەدۆڕاندنەکان گلەیی نەکەیت.

ئەگەر بتوانی هەر خولەکێك بە شەست چرکەی بەنرخ پڕ بکەیتەوە، ئەو کاتە هەموو دنیاو هەرچی هەیە بۆ تۆ دەبێتو لەمەش زیاتر کوڕەکەم دەکرێ پێت بوترێ مرۆڤ.

"رودیارو کیلپیلینگ"

دەمەوێ مرۆڤێك لە خۆم دروست بکەم

گەر لەم کارەدا سەرکەوتوو بووم،

لە هەر کارێکی دیکەدا بەختەوەر دەبم.

"کارنیلد"

رێگای وجود بێجگە لە بەردەڵان هیچ نیە
ئەوەی پێیدا بڕوات پەشیمان و ئەوی نەڕوات
شەرمەزارە.

"پەروین ئیعتصامی"

### تەرکی لەزەت

سەردەمێك کوڕێکی تەمەن بیست ساڵە بەقسەی یەکێك لە هاوڕێکانی ڕۆشت بۆ ماڵی ژنێکی سۆزانی، لەوێ لەسەر کورسیەکی باخی ماڵەکە دانیشت، پیرەمێردێکی داماوی لێ بوو ئەو ناوەی خاوێن دەکردەوە.

پیرەمێرد بەدەم ئیشکردنەوە نیگایەکی قووڵی لە کوڕەکە کرد پاشان هاتە بەردەمی لێی پرسی: "کوڕەکەم تەمەنت چەن ساڵە؟"

وتی: "بیست ساڵ."

پیرەمێرد وتی: "یەکەمجارە دێیتە ئێرە؟"

کوڕەکە وتی: "بەڵێ."

پیرەمێرد هەناسەیەکی پڕ دەردی هەڵکێشا وتی:

"دەزانم بۆچی هاتویت، پەیوەندی بە منەوە نیە، بەلام کوڕی خۆم ئەو تابلۆیە بخوێنەوە."

کوڕەکە چووە لای تابلۆیەك بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، پاشان بە دەنگێکی لەرزۆك ئەمەی خوێندەوە:

گەوهەری خۆت مەکێشە بە بەردی ناشایستەدا

ئارامبە تا پەیدا دەبێت گەوهەرناسێکی شایستە

تنۆکی ئەشکی پیرەمێرد بە ڕومەتە چڵکنو چرچەکەیدا هاتە خوارەوە، فرمێسکی سڕییو بوغزەکەی قووتدایەوە وتی:

"سەردەمێك منیش لەتەمەنی تۆدا بووم هاتمە ئەم شوێنەوە، چونکە هیچ کەسێکم نەبوو پێم بڵێت:

"لەزەتەکانی ئێستا، خەمەکانی دواتر لە خۆ گرتووە.

"ڕۆشتن بەدوای غەریزەی جنسی نەشیاو، وەکو لێسانەوەی هەنگوینە بەدەمی شمشێرەوە، هەنگوین شیرینە، بەڵام زمان دەقرتێنێ.

کەسێك نەبوو پێم بڵێت:

جوانیم لە پێناوی نادانیدا ڕۆشت، پیریی پەشیمانی

هەزار حەیف ڕۆژانی پیریی مرۆڤ هۆشیار دەبێتەوە.

پیرەمێرد ئەمەی وتو دەستی گرت بە نێوچەوانیەوەو گریا. شتێك لە دەرونی کوڕەکەدا بڵێسەی گرت، حاڵەتێکی سەیری هەبوو، بە پەلە لە شوێنی خۆی هەستاو قسەکانی پیرەمێردی لەبەر خۆیەوە دەوتەوە، چیتر جارێکیتر نەڕۆشتەوە بۆ ئەو شوێنە.

دیدگای هەر کەسێك باوەڕەکانی بەدی دێنێت
باوەڕەکانی هەر کەس سروشتی دروست دەکات
"مایکل ئالشتال"

## گۆڕینی دیدگا

بێوەژنێکی بێ نەوا دوو کوڕی هەبوو. ئەو هێندە لاوازو پەککەوتە بوو توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی نەبوو، بـژێوی ئـەوان پەیوەست بـوو بـە فرۆشتنی شتێکی ئاسانو هەمیشە ئەو خەمی کڕینو فرۆشتنی کوڕەکانی بوو.

یەکێك لە کوڕەکان چەتری دەفرۆشت، بۆیە بێوەژن هەموو بەیانیـەك زوو بێـدار دەبویـەوە یەکـەم کـاری تەماشـاکردنی ئاسمـان بـوو. ئەگـەر ئاسمان تاریكو هەورین بوایە بە خۆشیەوە دەیوت:

"سـوپاس بـۆ خـوا، دڵنیـام ئـەمڕۆ کوڕەکـەم چـەن دانـە چـەتر دەفرۆشێت." بەڵام ئەگـەر ئاسمـان سـاماڵ بوایـە، خـەمی دنیـای لـەکۆڵ دەگرت، ترس هەموو گیانی دەتەنی کە کوڕەکەی ئەمڕۆ چەتر نافرۆشێت.

کوڕەکەی دیکەی باوەشێنی دەفرۆشت، بێـوەژن کـە بـەیانی لـە خـەو بێدار دەبویەوەو لە ئاسمانی دەڕوانی، ئەگەر خۆر لە پشتی هەورەکانەوە بوایـە، ئەگـەری بـاران بـارین نـەدەبوو، ئـەمیش ناڕەحـەت دەبـوو لەبـەر خۆیەوە دەیوت:

"ئەمڕۆ هیچ کەسێك باوەشێن لە کوڕەکەم ناکڕێت."

باشیو خراپی کەشو هەوا هیچ کاریگەریەکی لە حاڵی ئەودا نەبوو، ئەو هەمیشە بابەتێکی بۆ ناڕەزایی هەبوو، ئەگەر خۆرەتاو بوایە ئەو هەستی ناڕەحەتی دەکرد، چونکە هیچ کەسێك چەتر لە کوڕەکەی ناکڕێت، ئەگەر هەوریش بوایە، دیسان هەستی ناڕەحەتی دەکرد، چونکە هیچ کەسێك کۆلارە لە کوڕەکەی ناکڕێت، بێوەژنی بێ نەوا بە هەبوونی ئەم تێڕوانینە نەرێنیە ژیانی خۆی تێکدا بوو.

ڕۆژێك بێوەژن توشی هاوڕێیەکی بوو پێی وت:

"ئازیزەکەم، تۆ بەهەڵە بیر دەکەیتەوە، لەهەردوو حاڵەتەکەدا تۆ براوە نیت، ئەگەر ئاسمان ساماڵ بێت خەڵکی کۆلارە دەکڕن، ئەگەر هەوریش بێت خەڵکی چەتر دەکڕن، تۆ ناتوانیت براوە بیت!"

ئەم مەنتیقە سادەیە لە ناخی بێوەژندا بزواو ئەوی گۆڕی، لەو کاتە بە دواوە بزەی ڕازیبونو ئەرێنی هەمیشە لەسەر لێوەکانی بوو.

"دنیس ڤیتلی" یەکێ لە ڕاوێژکارە بەرجەستەکانی بەڕێوەبردنو ڕێبەرایەتی دەڵێت:

ئەو شتەی کەسێك دەکاتە براوە، تواناو کارامەییو زرنگی نیە. دیدگای خۆیەتی نەك کارامەییەکان، دیدگا پێوەری بەختەوەریە.

"پرمۆدا باترا" دەڵێت:

بەوپەڕی کارامەیی خۆتانەوە، ئەگەر دیدگاتان نەرێنی بێت، هیچ شتێك مسۆگەر ناکەن.

"ئانتۆنی رابینز" دەڵێت:

ئەوەی جیاوازی نێوان ژیانی ئێمەو کەسانیتر دیاری دەکات، دیدگای

خۆمانە لە ڕوبەڕو بونەوەی دژواریەکان، نەك خودی دژواریەکان، یان ئەندازەو بچوکی و گەورەییان.

"جۆنسی مکسول" دەڵێت:

جیاوازی نێوان کەسەکان لاوەکیە

بەڵام هەمان جیاوازی لاوەکی دەبێتە جیاوازی گشتی،

جیاوازی لاوەکی هەمان دیدگاو جۆری تێڕوانینە

تاقە کەسێك کە ناگۆڕێت

ئەوانەن هەناسە نادەن.

"ئانتۆنی رابینز"

گۆڕانی دەورو بەر

لە کۆندا گوندێك هەبوو هەمیشە لە ژێر شاڵاوی بەرازو دڕەندەکاندا بوو. هەموو ڕۆژێك بەرازە کێویەکان بۆ خواردن شاڵاویان بۆ ئەو گوندە دەبرد. خەڵکی ئاوایی بەشێوەی جۆراو جۆر هەوڵیان دەدا ڕوبەڕویان ببنەوە، بەڵام هەوڵەکانیان بێ هودە بوو.

ڕۆژێك پیاوێکی ژیر چووە لای کوێخای گوندەکە بۆ ئەوەی چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، داوای لە خەڵکی ئاواییەکە کرد گوێ لە ڕێنماییەکانی بگرن، خەڵکەکە بەناچاری ڕازی بوون.

پێشنیاری کرد هەرکەسەو بڕێك خواردن لە ماڵەکانیان بێنن لە ناوەڕاستی گۆڕەپانێکدا داینێن، هەرکە ئەمەیان کرد بینیان سەدان بەراز هێرشیان بۆ خواردنەکە هێنا، سەرەتا بەرازەکان نیگەران دەردەکەوتن، بەڵام پاش ماوەیەك خەریکی خواردن بوون، ئەوان ڕۆژانە دەهاتن و

هەلکەکەش خواردنی بۆ دادەنان. پاش ماوەیەك پیاوەکە داوای لێکردن لە چوار لاوە چالێ گەورەیان بۆ هەلکەنن، چونکە بەرازەکان بە سەختی سەرگەرمی خواردن بوون ئاگایان لەوە نەمابوو لە دەورو بەریان چی ڕوو دەدات، دوای چەند هەفتەیەك بەرازەکان ئالودەی شێوەی ئەم خواردنە بوون، پاشان پیاوە ژیرەکە بە خەلکی ئاوایی وت بەچوار دەوری ئەو شوێنەدا شورایەك بکێشن بەلام ڕێگای هاتنە ناوەوەی بەرازەکان بهێلنەوە، سەرەنجام کاتێ کاری شورا لێدانو دەروازە تەواو بوو، خەلکی ئاوایی دەروازەیان داخستو هەموو بەرازەکان لەو گۆڕەپانەدا کەوتنە داوەکەوە، بەمشێوەیە لە بێ ئاگایی خۆیان شکستیان خوارد.

گەورەترین مەترسی لەکاتی گۆرانکاریدا، خودی گۆڕانەکە نیە، بەلکو کار کردنە بە مەنتیقی دوێنێ.

"پیتەر دراکر"

به ماڵو جوانی خۆت مەنازەو بایی مەبە
ئەمیان بەشەوێك دەڕواتو ئەویان بە"تا"یەك
"سەعد گورکانی"

بالول

ڕۆژێك هارونە ڕەشید بەوپەڕی بایی بوونو غروری سەروەتو سامانەوە قسەی بۆ بالول دەکرد. بالول وتی:

"ئەی خەلیفە، ئەگەر لە بیابانێکدا هێندە تینوت بێت نزیکی مردن بیت، چەندە لەسەروەتو سامانەکەت دەبەخشیت تاکو قومێك ئاوت دەسکەوێتو لە مردن ڕزگار بیت؟"

هارونە ڕەشید هەڵوەستەیەکی کردو وتی:

"نیوەی سەروەتەکەم دەبەخشم."

بالول وتی:

"ئێستا ئەگەر بتەوێ میزێك بکەیتو نەتوانیت لەبەر ئازارێکی سەخت نزیکی مردن بیت، چەندە لەسەروەتو سامانەکەت دەبەخشیت تاکو بتوانی میزێك بکەیتو لە مردن ڕزگار بیت؟"

هارونە ڕەشید دەستبەجێ وتی:

"نیوەی دیکەی سەروەتەکەم دەبەخشم."

بالول بەگاڵتە پێکردنەوە وتی:

"ئیتر تۆ بەچی دەنازیت؟ بە سەروەتەکەت؟ سەروەتێك نیوەی بۆ قومێك ئاوو، نیوەکەی دیکەی بۆ میز کردنێك؟"

هارونە ڕەشید سەری داخستو چیتر هیچی نەووت...

مرۆڤەکان دەربارەی چەندێتی دەسکەوتنی
ئەزمونەکانیان ژیرن، نەك دەربارەی
ئەو ئەزمونانەی دەستیان کەوتووە.

"جۆرج برنارد شۆ"

ئەزمون

رۆژێك حاکمی شارێك بانگەوازی کرد، هەرکەسێك دەتوانێ خواردنێك لێ بنێت، شێوازی ئامادەکردنەکەی بنوسێتەوە، بینرێت بۆ دارولحیکمە، چونکە چێشت لێنەری تایبەت دەیەوێ کتێبێکی خواردن ئامادە کردن بنوسێت، هەر کەسەو هەرچیەکی زانی نوسی، نۆبەی مەلای مەشهور هات. ئەو وتی:

"من خواردنێکی تازەم داهێناوە. شیرو هەنگوین تێکەڵ بکەن و لێی بنێن."

حاکم کە قسەکەی مەلای بیست، داوەتی کرد بۆ نانخواردنی بەیانی، تێکەڵەی شیرو هەنگوینی بۆ دانا، مەلا کەمێکی لێ خواردو حاڵەتی تێکچوو دەستی لە خواردن کێشایەوە، حاکم پرسی:

"مەگەر خۆت ئەم خواردنەت دانەهێناوە؟"

مەلا وتی:

"من دامهێنا بوو، بەڵام تاقیم نەکردبویەوە!"

سەرنج:

یەکێ لە فاکتەرە خێراکانی بەهرەوەریی لە تەمەن‌و ژیان، سوود وەرگرتنە لە ئەزموونی کەسانیتر، ئەمەیە لە ئەزموونی گەورەکان‌و داناکان پەند وەر بگرین، نیوەی ڕێگای مسۆگەر کردنی ئامانجیان بڕیوە، سوود وەرگرتن لە ئەزموونی بەنرخ‌و بەهای کەسانیتر، ڕێگایەکی ئاسان‌و دڵنیایە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکان.

ئەگەر شتێك لە مامۆستاکەتەوە فێر نەبویت

ڕۆژگار بە باجێکی گرانی خۆی دەبێتە مامۆستات!

ئێمە هەڵە ناکەین، تەنها فێر دەبین.

"ویلسۆن شف"

چارەسەری گوناه

ڕۆژێك "ئەبوبەکری شیبلی" چووە لای دکتۆرێك، خەریکی چارەسەری شێتێك بوو، شیبلی بە دکتۆرەکەی وت:

"دەرمانی گوناهت لا دەستدەکەوێ؟"

دکتۆر، واق بوو!

شێتەکە وتی:

"ئەگەر دەرمانی گوناهت دەوێ وەرە با فێرت بکەم!"

شیبلی، لێی نزیك بویەووە،

شێتەکە وتی:

بڕۆ ریشەی "نیازمەندی" کەڵای "پەشیمانی"و تۆوی "خۆراگریی" بێنەو بیکە هاوانێك‌و "تۆبە" بکەو بە "فرمێسك"و بە "نزا" بیکە بە مەرهەم‌و بیکەرە شوشەی "پارێزکاریی"یەوە، لە دەمەو بەیاندا هەستەو

ساویلکەو گەمژەیە.

بەڵام ئەفسەری مەشق دەیزانی فەرمانـدە لـە چ بارەیەکـەوە پرسـیار دەکات، بۆیە هەموو قوتابیەکانی کۆ کردەوە وتی:

"من دەزانم فەرماندە چ پرسیارێك دەکات، بۆیـە وەڵامـەکانم ئامادە کردووە ئێوەش بە وردی لەبەری بکەن تاکو دوچاری هیچ گرفتێـك نـەبن، بێگومان یەکەم پرسیاری فەرماندە ئەمەیە کە:

تەمەنت چەند ساڵە؟ هەموو تەمەنتان بیستو دوو ساڵەو دەبێت بڵێن بیسـتو دوو سـاڵ. دووەم پرسـیار ئەمەیـە کـە، چـەند سـاڵە لـەم مەڵبەندەیت؟ ئێـوە بڵـێن دوو سـاڵ، سـێیەم پرسـیار ئەمەیـە کـە: لێـرە هەست بە ناڕەحەتی دەکـەیت؟ ئێـوە دەبێـت بڵـێن کـە مـاڵو سـەربازگە هەردوکیان وەکو یەکن بۆ ئێمە."

قوتابی ساویلکە ئەم وەڵامانەی لەبـەر کـرد، ڕۆژی چـاو پێکـەوتن کـە نۆبـەی ئـەو هـات، فەرمانـدە پرسـی: "کـوڕی خـۆم مـاوەی چـەندە تـۆ لێرەیت؟"

قوتابی کـە هـەموو وەڵامـەکانی بـەدوای یەکدا لەبـەر کردبـوو، وتـی: "بیستو دوو ساڵ." فەرماندە سەرسام بوو وتی: "تەمەنت چەندە؟"

قوتابی وتی: "دوو ساڵ!"

فەرماندە توڕە بوو قیڕاندی: "ئەم قسە پڕوپوچانە چیە، تۆ شێتیت، یان من بە کەر دەزانیت؟"

قوتابی بە هێمنیەکەوە وتی: "هەردوکیان!"

ئەو چونکە ترسا بوو تەنها یەك وشەی دواین وەڵامی لە بیرمابوو...

سەرنج:

نابێت پرسەکان بە بێ بیر لێکردنەوە پەسەند بکەین، ئەم کارە کێشەی مەترسیداری بەدوادا دێت.

هەزار دوژمنی دانا باشترە

لە یەک دۆستی نادان...

"نیزامی"

## ئەقڵ و ژیریی

سوڵتانێک یەکێک لە جادوگەرەکانی خۆی بانگ کرد، داوای لێکرد لە بارەی تەمەن درێژیی خۆیەوە بۆچونێکی پێ بڵێت:

"سوڵتان سەلامەت، خاوەنشکۆ هێندە تەمەن درێژ دەبیت کە شاهیدی مەرگی ڕۆڵەکانت دەبیت."

سوڵتان زۆر تورە بوو، فەرمانیدا سەری لە لاشەی جیا بکەنەوە. پاشان یەکێکی دیکەی لە جادوگەرەکان بانگ کردو هەمان پرسیاری لەویش کرد. ئەویش لە وەڵامدا وتی:

"سوڵتان سەلامەت، لە بەختو ئیقباڵی خاوەنشکۆدا تەمەنێکی درێژ دەبینم بە جۆرێك زیاتر لەهەموو ئالو بەیتی خۆت دەژیت."

سوڵتان لە بیستنی ئەم قسەیە فەرمانیدا خەڵاتێکی باش زێڕو زیوی بکەن، هەردوو جادوگەرەکە لە راستی کارەکەیان دەزانی، بەڵام یەکێکیان خاوەنی ئەقڵو ژیریی بوو، ئەویتریان نا!

"ئیسمایلز" دەربارەی مرۆڤی ژیر دەڵێت:

کەسی ژیر تەنها بۆ خودی خۆی ناژی، بەڵکو بۆ خێرو چاکەی کەسانیتریش دەبێت هەنگاو بنێت."محەمەد حیجازیی"

ژیریی لە تەندروستی بە باڵاتر دەزانێو دەڵێت:

ژیریی لە تەندروستی باڵاترە، چونکە بە ژیریی دەتوانرێ تەندروستی بەدەست بێنرێت، بەڵام بە بێ ژیریی تەندروستی لەدەست دەچێت.

ئادەمی بوون بە ماهیەتە نەك بە رواڵەت

مرۆڤ بوون بە کەماڵە نەك بە جەماڵ...

ئادەم بە

رۆژێك پیرەمێردێك لەگەڵ کوڕەکەیدا دەژیا، رۆژێك کوڕەکە بە هۆی

ئەنجامدانی کاری نابەجێ بووه مایەی توڕه بوونی باوکی، باوکی هاواری کرد: "کوڕەکەم تۆ نابیته بنیادەم!"

کوڕەکە ڕقی هەستاو باوکی بەجێ هێشت!

ساڵانێك تێپەڕی...

کوڕەکە پێگەیشتبوو بوو بە حاکمی شارێك، ڕۆژێك فەرمانی دەرکرد کە باوکی بێنن، باوکی کە هاتە ژوورەوە، کوڕەکە بە گاڵتە پێکردنەوه پێی وت: "پیرەمێرد لە بیرت ماوه کە پێت وتم تۆ نابیتە بنیادەم! ئێستا ببینە!"

پیرەمێرد لەبەر پیریی بەسەختی دەیتوانی ببینێت، کەمێك سەیری ڕوخساری حاکمی کردو کوڕەکەی ناسیەوە، دەستبەجێ وتی: "بەڵێ، کوڕی خۆم بیرم ماوه، بەڵام من نەموت نابیتە حاکم، وتم کە نابیتە بنیادەم!"

بوونه زانا چەند ئاسانه، بوونه ئادەم زۆر گرانه...

"فارسی"

خۆپەرستێك ماڵێكی سوتاند

بۆ هێلکەو رۆنێك.....

"بیکن"

## خۆپەرستی

گوناهبارێك لە کاتی مردنیدا، دەرکەوانی دۆزەخی بینی، فریشتەی دەرکەوان پێی وت: "تاقە چاکەیەکی خۆتم پێ بڵێ، تاکو ئەو چاکەیە بتباتە بەهەشتەوە." پیاوەکە بیری کردەوە، جارێکیان بە دارستانێکدا دەڕۆشت، جاڵجاڵۆکەیەکی بینی، بۆ ئەوەی نەبێت بە ژێر پێیەوە ڕێگاکەی گۆڕی، فریشتە بزەیەکی کرد. لەو کاتەدا تاڵی جاڵجاڵۆکەیەك لە ئاسمانەوە شۆڕ بویەوە تاکو پیاوەکە سەرکەوێت پیایداو بچێتە بەهەشتەوە، گوناهبارەکانی دیکەش بەدوایدا سەرکەوتن، بەڵام پیاوەکە لە ترسی پچڕاندنی تاڵی جاڵجاڵۆکەکە گەڕایەوە ئەوان هەڵداتەوە خوارەوە، لەم کاتەدا تاڵەکە بچڕاو پیاوەکە گەرایەوە دۆزەخ، فریشتەکە پێی وت: "شەرمەزاریە خۆپەرستی تۆ تا ئەو ڕادەیە خێرەکەی تۆی گلێڕی ئەم شەڕە !"

"زیگ زیگلار" دەڵێت:

خۆپەرستی لەبەرزترین لوتکەدا کارێکی ئەوتۆ ناکات

بەڵام عەشق لە نزمترین جێگەی خۆیدا، جوانترین کاری لێ دەوەشێتەوە...

ئەگەر ژیان تێکەڵەی جۆش و خرۆش و بەدی هێنان

نەبێت، گەلێ مەینەتباریی و خۆ کوژییە...

بەدی هێنان

لۆریەکی بارهەڵگر، بە مەبەستی تێپەڕین بە ژێر پردێکی ژێر هێڵی ئاسندا گیری خواردبوو، هەوڵی شارەزایان بۆ رزگار کردنی بێ هودە بوو. بۆیە جەنجاڵیەکی زۆری لەهەردوو لای جادەکەوە دروست کردبوو. منالێك هەوڵیدا سەرنجی شارەزایانی ئەو بوارە بەلای خۆیدا کێش بکات. بەفشارێکی زۆرەوە خۆی دەکرد بەناو قەرەباڵغیەکەدا، سەرەنجام شارەزاکە لە کوڕەکە توڕە بوو وتی: "ناشێ تۆ فێرم بکەیت کە دەبێت چی بکەم؟"

کوڕەکە وەڵامیدایەوە:

"زۆر ئاسانە، کەمێ هەوای تایەکان فش بکەنەوە!"

سەرنج:

یەکێ لە بەرتوانایەکانی ئێمە هێزی بەدی هێنانە. بەدی هێنان واتا توانای دیتنی شتەکان بەشێوەی نوێ، بەزاندنی سنورەکان، دەرچوون لە تەوەر، بیرکردنەوە بە شێوەی جیاواز، داهێنانی شتی نوێ، سوود وەرگرتن لە شتی ناپەیوەندیدارو گۆڕینی بۆ شێوەی نوێ، تەمەن، ڕەگەز، تەنانەت خوێندنی باڵا فاکتەری سەرەکی بەدیهێنەر نین، بەڵکو

فاکتەری کۆشش و هێزی بزوێنەری خۆمان گەلێك گرنگە.
بەدی هێنان، واتا باشترین سوود وەرگرتن لە هەبوون و بارودۆخی ئێستا...
"کارل میز"

هەرچەن فێری زانیاری بیت
گەر کاری پێ نەکەیت نادانیت.
"سەعدی شیرازی"

زانست

زانایەك بە کەسێکی وت: "بۆچی لە بواری زانستدا ناخوێنیت؟"
کەسەکە وتی: "ئەوەی کورتەی زانستە خوێندوومە."
زاناکە لێی پرسی: "کورتەی زانست چیە؟"
وتی پێنج شتە:
یەکەم: تاکو راستی تەواو نەبێت، درۆ ناکەم.
دووەم: تاکو حەڵاڵ تەواو نەبێت، دەست بۆ حەرام درێژ ناکەم.
سێیەم: تاکو نەفسی خۆم نەپشکنم، بەدوای عەیبی کەسدا ناگەڕێم.
چوارەم: تاکو خەزێنەی رزقی خودا تەواو نەبێت، پەنا بۆ دەرگای هیچ کەسێك نابەم.
پێنجەم: تاکو پێ نەنێمە بەهەشتەوە، لە فێڵی شەیتان و نەفسی خۆم غافڵ نابم.

دریژترین سەفەری ژیان...

برینی مەودای نێوان زەین و دڵە

رێبوار

کۆڵە پشتەکەی هەڵگرت و کەوتە رێ، رۆشت بەدوای خودادا بگەرێ وتی: "تاکو کۆڵەکەم پڕ نەکەم لە خودا ناگەرێمەوە." نەمامێکی پاراو بچوك لە رێگاکەیدا وەستا بوو، رێبوار بە بزەیەکەوە رووی کردە درەختەکەو وتی: چەند ناخۆشە لەکەناری جادەدا بیت و نەرۆیت." درەخت لەبەر خۆیەوە وتی:

"بەلام لەوەش ناخۆشتر ئەمەیە برۆیت و بەدەستی بەتاڵ بگەرێیتەوە. خۆزگە دەتزانی ئەوەی بەدوایدا دەگەرێیت لەوێیە!"

رێبوارەکە رۆشت وتی:

"درەختێك چی لەبارەی رێگەوە دەزانێت، پێیەکانی لە خاکدایەو ئەو هیچ کاتێ چێژی گەڕان نازانێت."

گوێی لێ نەبوو کە درەخت وتی:

"بەڵام من گەڕانم لە خۆمدا دەست پێکردووەو کەس سەفەری من نابینێت."

ڕێبورا ڕۆشتو بارەکەی گران بوو. هەزار ساڵ تێپەڕی، هەزار ساڵ پڕ پێچو پەنا، هەزار ساڵ بەرزو نزم.

ڕێبوار گەڕایەوە، ڕەنجەڕۆو نا ئومێد، خودای نەدۆزیبویەوە، بەڵام غروری وون کردبوو، گەیشتبووە سەرەتای ڕێگاکە، ئەو ڕێگایەی ڕۆژێك لەوێوە دەستی بەسەفەر کردبوو، درەختی هەزار ساڵە، باڵابەرزو سەوز پاراو، لە ژێر سێبەرەکەیدا دانیشت تاکو کەمێك پشوو بدات، ڕێبوار ئەو درەختەی بیر نەکەوتەوە، بەڵام درەخت ئەوی ناسیەوە وتی: "سڵاو، ڕێبوار، چی لە هەگبەکەتدایە؟ ئەو ڕۆژەی ڕۆشتیت، هەموو شتێك لەهەگبەکەتدا هەبوو، غرور کەمترینیان بوو. بەڵام ڕێگا لێی سەندیت، ئێستا لە هەگبەکەتدا شوێنی خودا هەیە.

" درەخت کەمێك هەقیقەتی کردە هەگبەکەی ڕێبوارەکەوە. دەستەکانی ڕێبوار پڕبوون لە نوری ئیشراق، چاوەکانی لە غروودا دەبریسکانەوە، وتی:

"هەزار ساڵ گەڕامو نەمدۆزیەوە، کەچی تۆ لە جێی خۆتیت، ئەم هەمووەت دۆزیەوە!"

درەخت وتی:

"گرفت ئەمەیە تۆ بەڕێگا ڕۆشتیتو من لە دەرونی خۆمەوە، پەی بردن بە خود دژوارترە لە پەی بردن بە ڕێگا."

"مارسل پرۆست" دەڵێت:

سەفەری راستی بۆ دۆزینەوە، رۆشتن نیە بۆ شوێنە تازەکان، بەڵکو دۆزینەوەی تێڕوانینە تازەکانە.

ئەگەر بە بەخشین مرۆڤ بچوک ببێتەوە

خودا تا ئەو ئەندازەیە گەورە نەدەبوو.

"جامی"

## هێزی بەخشین

دەروێشێك بە شاخ و کێوێکدا دەگەڕا، رۆژێك بەردێکی گرانبەهای لە لێواری جۆگەیەکدا دۆزیەوە، رۆژی دواتر توشی ڕێبوارێکی برسی بوو، خورجینەکەی کردەوە تاکو کەمێك خواردنی لەگەڵ بخوات. ڕێبواری برسی بەردە گرانبەهاکەی لە خورجینی دەروێشەکەدا بەدیکردو داوای

لێکرد پێی بدات. دەروێشەکە دەستبەجێ دڵی نەشکاندو بەردەکەی پێدا، ڕێبوارەکە لە خۆشی ئەوەی بەخت یاوەری بوو نەیدەزانی چی بکات.

ئەو دەیزانی ئەو بەردە هێندە گرانبەهایە تا کۆتایی تەمەنی بەشی دەکاتو دەتوانێ بە ئاسانی ژیانی پێ بەسەر ببات، چەند ڕۆژێ دواتر ڕێبوارەکە کەوتەوە ڕێ تا هەرچی زوترە دەروێش بدۆزێتەوە، سەرەنجام دەروێشی دۆزیەوەو بەردەکەی بۆ گەڕاندەوە وتی:

"زۆر بیرم کردەوە دەزانم ئەم بەردە چەند گرانبەهایە، بەڵام بۆت دەگەڕێنمەوە بە هیوای ئەوەی شتێکی گرانبەهاترم پێ بدەیت، ئەگەر دەتوانیت ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکە کە ئەو هێزەی پێی بەخشیت ئەم بەردەم پێ ببەخشیت!"

خراپترین خەسڵەت،

ئاشکرا کردنی عەیبی کەسانیترە...

"سەعدی شیرازی"

### دادوەری

لە گۆندا پیاوێکی گەنج لە مۆزێکدا هەڵەیەکی ناشیرینی کرد. گەورە پیاوانی مۆزەکە کۆ بوونەوە تاکو دەربارەی ئەو هەڵەیە بڕیارێك بدەن.

سەرەنجام بڕیاریاندا لە بارەی هەڵەی پیاوەکەوە لەگەڵ ڕیش سپی هۆزەکە کە خاوەن ئەزمونێکی زۆر بوو راوێژ بکەن، هەرچی ئەو بڵێت جێ بەجێی بکەن.

داوایان لە ریش سپی هۆزەکە کرد، لەبارەی هەڵەی پیاوەکەوە بۆچونی خۆی بڵێت، بەڵام ئەو لەئەنجامدانی ئەم کارە ناڕازی بوو، گەورەی هۆزەکان دوبارە ناردیان بە شوێنیداو داوای بڕیاری کۆتاییان لێ کرد.

ڕیش سپی هۆزەکە، گۆزەیەکی کونی پڕ کرد لە ئاو، پاشان بەستیە پشتی خۆیو بەرەو پیاو ماقوڵانی هۆز کەوتەڕێ، پیاو ماقوڵان بەدیتنی لێیان پرسی: "ئەم گۆزەیە چیە؟"

ڕیش سپی وتی: "گوناهەکانم لە دوای خۆمەوە دەڕۆنو ناگەڕێنەوە. بێ ئەوەی بیان بینم، ئەمڕۆ هاتووم دەربارەی گوناهێکی دیکە دادوەری دەکەم. پیاو ماقوڵان بە بیستنی ئەم قسەیە لە گوناهی پیاوەکە خۆش بوون.

کەسانێك کە ڕێگای خودا شارەزان
لە تاریکیشدا دەیبینن.

"میك لارن"

## باڵوڵو قیبله

باڵوڵ دوای بڕینی ڕێگایەکی درێژ گەیشتە نزیکی ئاوایيەكو لە ژێر درەختێکدا ویستی پشوو بدات، قاچەکانی ڕاکێشاو دەستی خستە ژێر سەری. پیرەمێردێك چووە لای بە نارەحەتیەوە هاواری کرد: "تۆ چ کافرێکیت!"

باڵوڵ کە ئارامی خۆی لەدەستدابوو، وتی:

"بۆچی جنێووم پێ دەدەیت، چۆن دەزانی من کافرو گوناهبارم؟"

پیرەمێرد وتی: "تۆ بە تەواوی لێی ڕاکشاویت، قاچەکانت ڕوو کردۆتە مەککەی پیرۆز، بۆیە سوکایەتی بە خودا دەکەیت."

باڵوڵ دوبارە لێی ڕاکشایەوە، لەکاتێکدا چاوەکانی نوقاند وتی:

"ئەگەر تۆ دەتوانی بەلایەکدا بمسوڕێنە خودای لێ نەبێت."

خودایەك لەم نزیکانە... لەم شەوی ئەنگوستە چاوە... لای ئەم دارکاژە بڵندە...لەسەر ئاگایی ئەم ئاوە.... لەسەر یاسای گژوو گیایە...

"سوهراب سپێهری"

**هێندەی بۆ تەمبێ کردن، ڕێخراوی هەمەجۆر هەیە**
**بۆ هاندان هیچ شوێنێك بوونی نیە.**

"شارل دوگل"

**هاندان**

بازرگانێـك سـکەیەکی یـەك دۆلاریـی کـردە کاسـەی گوڵفرۆشـێکی گەڕیدەوەو بە پەلە لێی دور کەوتەوە، بازرگانەکە چەند سەد مەترێك لێی دور نەکەوتبویەوە دیسان گەڕایەوە بۆلای، پاشان کە لقێك گوڵی دڵخوازی خۆی لە نێو چەپکە گوڵەکانـدا هەڵبـژارد، ڕویکـردە گوڵفرۆشـەکەو وتـی: "ببـورە پەلـەم بـوو، نـەمتوانی گوڵەکـەم ببـەم، تـۆیش هـەروەکو بەنـدە بازرگانیـت، هـەم گوڵـەکانت تـەڕو پـاراوە، هـەم نرخـەکانیان گونجـاوە، هیوادارم کاتێ پارەکەم پێدایتو بیرم چوو گوڵەکەم ببەم بمبوریت."

بازرگان بە وتنی ئەم قسەیە، لێـو بـە خەنـدەوە، بـە پەلـە ملی ڕێی گرتو ڕۆشت. چەند هەفتەیەك دواتر کاتێ بازرگـان خـەریکی نـانخواردنی بەیانی بوو، پیـاوێکی شـیکپۆش لـە مێزەکـەی نزیـك بویـەوەو خـۆی پـێ ناساند: "دڵنیام نامناسیتەوە، منیش ناوی تـۆ نـازانم، بـەڵام بـاوەڕ بکـە هـەرگیز ڕوخسـاری تـۆم لەبـەر چـاو وون نابێـت، تـۆ ئـەو پیاوەیـت بـە هاندانەکەت وات لێکردم ببمە کەسێکی خۆم، من گەڕیدەیەك زیاتر نەبووم تاکو تۆ بەهاو نرخی خۆمت بۆ گەڕاندمەوە، ئێستا هەسـت دەکـەم وەکو بەڕێزت بازرگانێکم!"

لە مەڵبەندی هەر دڵێکدا ژورێکـی تۆمـارکردن هەیـە، هـەتا ئـەم ژورە پەیامی هیوا بەخشو هاندان تۆمار بکات، بە جوانی دەمێنیتەوە!"

هەموو بونەوەری گەردون کۆکن لەسەر ئەوەی ئامانجی سەرەکی لە ژیاندا چێژ وەرگرتنە لێی.

"ساموئیل پاتلر"

چێژی ژیان

دوو مەیمون لەسەر لقی درەختێک دانیشتبوون و لە ئاوابوونی خۆریان دەڕوانی. یەکێکیان بەوی تریانی وت:

"بۆچی کاتی خۆرئاوا بوون ڕەنگی دنیا دەگۆڕێت؟"

مەیمونی دووەم وتی: "گەر بمانەوێ هەموو شتێک ڕوون بکەینەوە دەرفەتی ژیان نامێنێت، هەندێجار دەبێت بە بێ ڕونکردنەوەی ئەو ڕاستیەی لەدەورو بەرت هەیە دەبێت چێژ ببینیت."

مەیمونی یەکەم بە نابەدڵیەکەوە وتی: "تۆ تەنیا بەدوای چێژی ژیاندا دەگەڕێیت، هیچ کاتێ ناتەوێ ڕاستیەکان بە مەنتیقەوە دەربڕیت."

لەم کاتەدا هەزار پێیەک بەلایاندا تێپەری، مەیمونی دووەم بە دیتنی هەزار پێ لێی پرسی:

"هەزار پێ، تۆ چۆن ئەم هەموو پێیە بەهەماهەنگی دەجوڵێنیت؟"

هەزار پێ وتی: "تا ئەمڕۆ بیرم لێ نەکردۆتەوە."

مەیمونی دووەم وتی:

"کەواتە بە جوانی بیری لێ بکەرەوە، چونکە ئەم مەیمونەی هاوڕێم دەربارەی هەموو شتێک ڕونکردنەوەی مەنتیقی دەوێت."

هەزار پێ، سەیرێکی پێیەکانی خۆی کردو ویستی ڕونکردنەوەیەک بدات: "ئا... سەرەتا ئەم پێیەم دەجوڵێنم، نا، نا، ڕەنگە ئەویتریان بێت،

دەبێت سەرەتا جەستەم بجولێنم..."

هەزار پێ، هەرچەن زیاتر هەولی دەدا تاکو باشتر بدوێت، بەلام بەنائومێدیەوە هەولیدا درێژە بە رۆشتنەکەی خۆی بدات. بەلام سەیری کرد کە ناتوانێت، بە نیگەرانیەوە وتی:

"سەیرکە چ بەلایەکت بەسەر هێنام، هێندە هەولمدا چۆنێتی جولەی خۆم باس بکەم ئەوەتا رۆشتنم بیر چۆتەوە."

مەیمونی دووەم بە مەیمونی یەکەمی وت:

"دەبینیت! کاتێ دەتەوێ هەموو شتێك ڕوون بکەیتەوە ئاوای لێ دێت." دوبارە لە خۆئاوا بوونی ڕوانیەوە تاکو چێژ وەربگرێت.

**گۆرانم بۆ کەسێك کە شایستەی بم تاکە ئامانجی ژیانە....**

**ناودارانی جیهان پێش ئەوەی ناوبانگ دەربکەن...**

- ئەنیشتاین (فیزیکدان)...... نوسەری ئیدارەی تۆمار.
- ئوهنری (نوسەر) ......گاوان.
- گاریبالدی (کودەتا خوازی ئیتالی)....مەلەوان.
- شون کانری (ئەکتەری سینەما) ... شۆفێری لۆری.
- کلارك گیبل (ئەکتەری سینەما) ...داربڕ.
- ویلیم فالکنر (نوسەر)... وێنەکێشی بیناسازیی.
- گاندی (ڕێبەری هەژارانی هیند) ... پارێزەری دادگا.
- جۆرج واشینگتۆن (یەکەم سەرۆك کۆماری ئەمریکا)...جوتیار.
- نادرشا ئەفشار (دامەزرێنەری زنجیرەی ئەفشاریە) ...پینەدۆز.

- ئەرەخی سیستانی (شاعیری ناوداری ئێران) ...جوتیار.
- ئەلپەتکین (دامەزرێنەری زنجیرەی غەزنەوی) ... کۆیلە.
- پاندیت نەهرۆ (سەرۆك وەزیران)... پارێزەری دادگا.
- سامۆئیل مۆریس (داهێنەر) ...نیگارکێش.
- جاك لەندەن (نوسەر) ...کرێکاری کەشتی.
- ئەلبێر کامۆ (نوسەری فەرەنسی) ....مامۆستا.
- ئابراهام لینکۆڵن (سەرۆك کۆمار) ....دار بڕ.
- چارلز دیکنیز (نوسەری ئینگلیزیی) ... نوسەر.
- ئانتۆل فرانس (نوسەری فەرەنسی)... کتێب فرۆش.
- مۆلێر (گەورە نوسەری فەرەنسی) ... ئەکتەر.
- هێربرت جورج ولز (گەورە نوسەری ئینگلیزیی) شاگرد بەقاڵ.
- ئێرنست همینگوی (گەورە نوسەری ئەمریکی).. پەیامنێر.
- ویلیم شکسپیر (گەورە نوسەری ئینگلیزی) ..ئەکتەری گەرۆك.
- فیدل کاسترۆ (سەرۆك کۆماری کوبا) ... قوتابی مافپەروەر.
- ناپلیۆن پۆناپەرت (ئیمپراتۆری فەرەنسا)..ئەفسەری تۆپخانە.
- کەریم خانی زەند (دامەزرێنەری زەندیەکان).. تیرئەنداز.
- هێنری فۆرد (کارخانەداری ئەمریکی) ... سەعاتچی.
- تۆماس ئەدیسۆن (داهێنەری کارەبا) ...تەلگرافچی.
- ئالفرێد نۆبل (دامەزرێنەری خەڵاتی نۆبل) ...کرێکار.
- والت دیزنی (داهێنەری سینەمای ئەنیمەیشن) ...گەڕیدە.
- مایکل ئانجیلۆ (پەیکەرسازی ئیتالی) ... بەردتاش.

دۆستێکی دانا هەڵبژێرەو
ڕاوێژی پێ بکە.

"مەولانا"

## ڕێنمایی تەواو

ڕۆژێك پاشایەك دەیویست بە پانایی ڕوبارێکدا بپەڕێتەوە، نەیدەزانی قوڵایی ڕوبارەکە چەندە، ئەسپەکەی دەتوانێ بپەڕێتەوە یان لە یەکەم هەنگاویدا نووقم دەبێت، بۆ دۆزینەوەی چارەیەك سەیرێکی دەورو بەری خۆی کردو منداڵێکی لەو ناوەدا بینی. داوای ڕێنمایی لێکرد، منداڵەکە سەیرێکی ئەسپی پاشای کردو پاش کەمێك بیرکردنەوە وتی پاشاو ئەسپەکەی دەتوانن بە ئاسانی بە پانایی ئەم ڕووبارەدا بپەڕنەوە، پاشا بەسواری ئەسپەکەیەوە ڕۆشتە روبارەکەوە.

کاتێك گەیشتە ناوەڕاستی ڕوبارەکە سەرنجی قوڵایی ئاوەکەیدا زۆری نەمابوو نوقم بێت، دوای ئەوەی توانی بە زەحمەت خۆی ڕزگار بکات، بەهاوار کردنەوە بەرەو منداڵەکە ڕۆشتو هەڕەشەی لێکرد کە سزای دەدات. منداڵەکە دەستەوسان بوو بە داماویەوە وتی:

"بەلام خاوەنشکۆ من دەبینم مراویەکانم هەموو ڕۆژێك بە بێ هیچ گرفتێك لەمبەرەوە دەچنە ئەوبەرو دێنەوە، خۆشتان دەبینن قاچی مراویەکانی من گەلێ لە قاچی ئەسپەکەی تۆ کورتترە.

## ئامانجی گەورە، دەستکەوتی گەورە بەدی دێنێت

"ئانتۆنی رابینز"

### ئامانجی گەورە

سێ کەس لە یەکێك لەکانە بەردەکاندا کاریان دەکرد، کاری ئەوان داتاشینی ئەو بەردانە بوو کە لە کانزا دەردەهێنرا، ئەم سێ کەسە هاونەمەنە لەهەموو رویەکەوە هاوشێوەی یەکتر بوون. رۆژێك سەرۆکەکەیان بەرێکەوت سەرنجیدا وێرای ئەوەی ئەم سێ کەسە هاوشێوەی یەکترین، بەڵام یەکێکیان کارەکانی بە پەرۆشەوە ئەنجام دەدات و ئەڵێی ماندوو نابێت. دووەمیان تا ڕادەیەك لەگەڵ کارەکاندا گونجاوو ڕێك و پێکە، سێیەمیان هێندە گوێ بە کارەکانی نادات، هەرچەن هەوڵ دەدات ئەرکی خۆی بەجێ بێنێت، بەڵام چاوی هیوای لە کارەکانی نیە. سەرۆك بیری کردەوە، بۆچی دەبێت ئەو کارەی ئەم سێ کەسە ئەنجامی دەدەن تا ئەم ڕادەیە جیاوازیان هەبێت، لە ناکاو وەڵامێك لە مێشکیدا هاتە پێشەوە: "هەژین"، گومانی کرد جیاوازیەك لەکاری ئەم سێ کەسەدا دەردەکەوێت پەیوەستە بە هەژینی کارەکەیانەوە، بۆیە بڕیاریدا بچێتە لایان و لە نزیکەوە گفتوگۆیان لەگەڵ بکات.

یەکەم جار لەو یەکەمیانی پرسی کە زۆر گرنگی بە کار نەدەدا وتی: "بە چ کارێکەوە خەریکیت؟"

وتی: "بەرد دەتاشم."

سەرۆك وتی: "هەر ئەوەندە؟"

وتی: "بەڵێ."، پاشان ڕۆشتە لای دووەمیان کە تارادەیەك گرنگی بە کارکردن دەدا، هەمان پرسیاری لەویش کرد، ئەو وتی: ئەم بەردانە دەتاشم تاکو هەیوانێك دروست بکەم"و بزەیەکی کەوتە سەر لێو، سەرۆك ڕۆشتە لای ئەوەی کە بە پەرۆشەوە کاری دەکرد، هەمان پرسیاری لێکرد. ئەو هەستو هەژینێکی تایبەتەوە وتی: "دەمەوێ کۆشکێکی گەورەو نایاب دروست بکەم، کە لەسەر ئەم شاخە جێیەك بگرێت، ئەم بەردانە بۆ ستونی کۆشکەکە بەکار دێنم، پاشان بەردەکانی دیکە بۆ دروستکردنی دیوارو دەروازەکانی، کۆشکێکی بەشکۆو بێ وێنە، هەرکەس لێی بڕوانێ دەستخۆشیو ستایشی ئەو کەسە بکات کە دروستی کردووە !"

سەرۆك لە گفتوگۆی ئەم سیانەوە وەڵامی خۆی وەرگرتەوە، بزەیەکی کردو دەستی کرد بە پیاسە کردن، لەم توێژینەوەیە خۆشحاڵ بوو، پەی بەخاڵێکی گەورە بردبوو، خاڵێك دەیتوانی سەرچاوەی گۆرانکاری گەورەو بنەمایەکی پتەوی ئایندە بێت، ئەو هەمیشە لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئامانجی گەورە، هەڵوێستی مەزن، کارامەیی زیاتر.

سەرنج:

کرداری مرۆڤەکان پەیوەستە بە هەڵوێستەکانیانەوە، هەرچەن خواستەکانی ناخی مرۆڤ مەزن بێت، کارامەیی بەرەو باڵا دەچێت، خواستی بەتین، لەئامانجی گەورەو شکۆدارەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆنەوەی بەجۆشو خرۆشەوە بێتە ئاراوە، کارە بچوکەکانی خۆت پەیوەست بکە بە ئامانجی گەورەوە، ئامانجەکانت وەکو سەرچاوەیەکی شیرین لەبەر دەمتاندا هەڵبقوڵێت.

خواردن بۆ ژیانە، نەك ژیان بۆ خواردن.
"سەعدی شیرازی"

## هونەری پاشەکەوت کردن

ڕۆژێك پیاوێکی دەوڵەمەند کۆشکێکی گەورەی دروستکردو پاشای بۆ نانخواردن داوەت کرد. پاشا دەستی کرد بە گەڕان بەناو کۆشکەکەداو لە گۆشەو کەناری ورد بویەوە. تاکو گەیشتە چێشتخانەیەکی زۆر بچوك، پاشا بە سەرسامیەوە پرسی:

"ئەم چێشتخانەیە بەم تەسکیو بچوکیەو کۆشکێك بەم گەورەیی و جوانیە ناگونجێت!"

پیاوە دەوڵەمەندەکە بە پێکەنینەوە وتی:

"خاوەنشکۆ، تەنگو تەسکی چێشتخانەکەیە فراوانی بەم کۆشکە بەخشیوە!"

"فراسۆ والتر دەڵێت"

بەختەوەری وەکو هەموو بەخششێك لە دوو شتەوە بەدی دێت، پاشەکەوتو کۆشش.

پاشەکەوت، خۆ بەخۆ هونەرو سەرچاوەی دەرامەتە.

ئەو کەسەی خێرو خۆشی بۆ کەسانیتر

دەستەبەر دەکات، خێرو خۆشی بۆ خودی

خۆی دەستەبەر کردووە.

"کۆنفۆشیوس"

**مەرامی دروست**

پیاوێک شەکەت و ماندوو لە کاری ڕۆژانە لە گۆشەی مزگەوتێکدا لە شاری مەککەدا خەوتبوو، ئەو بەدەنگی گفتوگۆی دوو فریشتە بێدار بویەوە، کاتێ بە جوانی گوێی گرت دوو فریشتەکە دەربارەی ئامادە کردنی لیستێک لە کەسانی مەعنەوی دەدوێن، یەکێک لە فریشتەکان وتی: "هاوڕێم، محبوب خان کە لەشاری ئەسکەندەریە دەژی، کەسی یەکەمی ئەم لیستەیە، بەڵام ئەو هیچ کاتێ نەهاتوتە شاری مەککەی پیرۆزەوە."

بە بیستنی ئەم قسانە پیاوەکە نوقمی بیرکردنەوە بوو. بە خۆی وت: "ئەم مەحبوب خانە کێیە بەمجۆرە مایەی سەرنجی فریشتەکانە؟"

ئەو پێی سەیر بوو چۆن تا ئێستا نەهاتوتە شاری مەککەی پیرۆز کەسی یەکەمی ئەم لیستەیە، بڕیاریدا بچێتە شاری ئەسکەندەریەو بە شوێنیدا بگەڕێت، سەرەنجام دوای ڕۆشتن و گەڕانێکی زۆر زانی ئەم کەسە پینەدۆزێکی پیرە و لەو شارەدا خەریکی پینە کردنی پێڵاوی خەڵکە.

پیاوەکە چووە لای مەحبوب خان و لەگەڵ ئەو پیرەمێردە پەککەوتوەدا دەستی کردە گفتوگۆو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، مەحبوب خان پێکەنی وتی:

"من پیاوێکی هەژارم، دوای ساڵانێک ڕەنج و کۆشش بڕە پارەیەکم

پاشەکەوت کردبوو، رۆژێ لە رۆژان کە هاوسەرەکەم دوگیان بوو، بریارمدا خواردنێکی خۆشی بۆ بکرِمو خۆشحاڵی بکەم، کاتێ بە بازاردا دەرۆشتم، دەنگی گریانی مناڵێکی هەژارم بەر گوێ کەوت کە دیاربوو زۆری برسی بوو، پەرێشانی کردم، چیتر نەمتوانی هەنگاوێك هەڵگرم، ئەو خواردنەی پێم بوو دامە دەستی مناڵەکەو هاتمە دواوە، لەو بزەیەی کەوتە سەر لێوی مناڵەکە چێژێکی تەواوم بینی."

پیرەمێرد، بە بۆنەی ئەم کارەوە پلەیەکی بەرزی لای خودا بەدەست هێنا، پلەیەك کەم کەس بتوانێ بەدەستی بێنێت.

ئەفلاتون دەڵێت: هەرکەسێك لە بیری خێرو چاکەی کەسانیتردا بێت، سەرەنجام بەختەوەری خۆی مسۆگەر دەکات.

گاری ئارتۆر دەڵێت:

لەگەڵ دڵی خۆتدا بدوێ نیگەران مەبە چی ڕوودەدات. بەو مەرامەوە کە باشترین خێرو چاکەی خەڵکیت دەوێت دەستبەکاربە.

تاقە کەسێك لەگەڵ مندا ڕەفتاری
دروست دەنوێنێ بەرگدروەکەمە.
هەر جارێ کە دەمبینێ، سەر لەنوێ ئەندازەم دەگرێتەوە.
ئەوانیتر، بە هەمان ئەندازەی پێشوو
ڕەفتارم لەگەڵ دەکەن، وادەزانن
دەبێ من خۆم لەگەڵ ئەواندا بگونجێنم!

"جۆرج بیرنارد شاو"

بۆ مسۆگەر کردنی هەر شتێك
دەبێت بوێریی شکست
خواردنت هەبێت.

"کرك داگلاس"

بوێر بین

- ئازایەتیو بوێریی هەروا ئاسان نیه، دلێریی خەسڵەتێکه، فێڵو فریو ناخوازێت. "ناپلیون"
- ئازایەتی لەوەدا نیە، مرۆڤ مەترسی نەبینێت، بەڵکو لەوەدایە مەترسی ببینێتو زاڵ بێت بەسەریدا. "دیشتر"
- شمشێری تیژ دەدرێتە دەست کەسی چاونەترسو بوێر. "پەندی چینی"
- دەرخستنی ئازایەتی، هەندێجار ئاکامی چاوەڕوان نەکراوی لێ دەکەوێتەوە. "جاکسۆن"
- بەرگە گرتنو خۆراگریی بالاترین دلێرییو بوێرییە. "لویی پاستۆر"
- پیاوی ترسنۆك ئەو کەسەیە، لەو شوێنەدا کە دەبێت قسە بکات، بێدەنگ دەبێت. "ئابراهام لینکۆڵن"
- یەکەم مەرجی بەختەوەریی، شکۆداریو بێ باکیە. "ناپلیۆن"

- هەروەك لە سەد پیاوی گەمژە پیاوێكی ژیر دروست ناكرێت، ئاواش لە سەد پیاوی ترسنۆك پیاوێكی ئازا دروست ناكرێت.
- بوێریی هەروەك عەشق، لە هیواوە سەرچاوە دەگرێت. "ناپلیۆن"
- بنەمای ئازایەتی، پشت بەخۆ بەستنە. "شارل دوگل"
- ئازایەتی بە مانای نەترسان نیە، ئازایەتی واتا ئەنجامدانی ئەو كارەی لێی دەترسین. "شلدون كوپ"
- زۆر حەز بەئارامی كردن، رێگری ئەنجامدانی كاری گەورەیە، ئازایەتی‌و بوێریی كاریگەری دیكەی هەیە، مەزنترین سوودەكانی كردنەوەی دەرگا داخراوەكانە.
- شكۆی كەسە مەزنەكان لە هاتنە دی خەونەكانیان، بەرەنجامی حەزو خولیای خۆیانە، نەك پلەو پۆستەكانیان.

"جۆنسی مكسول"

لە وێنە فریو دەرەکانی جیهانی خەیاڵدا
جوانی ئەوە کە حەز لە وێنە دەکەم.
"عبدالرفیع حقیقت"

## نیو کیلۆبە

لە یەکێك لەهۆزەکانی عەرەب، لاوێك عاشقی کچی یەکێك لەسەرۆك خێڵەکان بوو، خەڵکی نارد بۆ خوازبێنی، بەڵام باوکی کچەکە قایل نەبوو وتی: "مارەیی کچەکەم، ئەسپێکی گرانبەهای یەکێك لەگەورەکانی عەرەبە، ئەگەر ئەوەم بۆ بێنیت ئەوا کچەکەمت پێ دەدەم، ئەگەر نا ئەوا داواکردن شتێکی مەحاڵە."

لاوەکە کاتێ ئەم قسەیەی بیست، بۆ بەدەست هێنانی ئەو ئەسپە بیری لە فێڵێك کردەوە، رۆشتو ڕێگەی بە پیاوی خاوەن ئەسپەکە گرت، کاتێ ئەو بەسواری ئەسپەکەیەوە هات، کوڕەکە خۆی کەساس کردو داوای یارمەتی لێکرد کە سواری بکات، خاوەن ئەسپەکە بەزەیی پێیدا هاتەوە وتی لە پشتمەوە سواربە.

لاوەکە وتی: "گەورەم، من ناتوانم سوار بم، قاچەکانم ژان دەکەن!"

پیاوەکە لە ئەسپەکەی پیادە بوو، ویستی ئەو سوار بکاتو دواتر خۆی سوار بێتەوە، کاتێ لاوەکە سوار بوو لەچاوتروکانێدا تێی تەقاندو رۆشت. پیاوەکە هاواری کرد: "ئەی لاو، ئەسپەکەت فڕاند، بەڵام بوینە هۆی ئەوەی ڕێگای خێرو چاکە دابخەیت."

لاوەکە بیری کردەوە، ئەمە هیچ بایەخێکی نیە، لەو کارەی پەشیمان

بوبەوە، گەڕایەوە ئەسپەکەی دایەوە دەستی پیاوەکە، پیاوەکە سەرسام بوو هۆی ئەم کارەی لە لاوەکە پرسی، وتی:

"من هیچ تەمایەکم لەم ئەسپەدا نەبوو، بەڵام مەسەلەی ژن هێنان ناچاری کردم."

پاشان داواکاری باوکی کچەکەی بۆ گێڕایەوە:

ئەو پیاوە مەزنە، دەستی لاوەکەی گرت، بە هەمان ئەو ئەسپەوە هاتنە بەردەرگای ماڵی باوکی کچەکەو لە دەرگایاندا. باوکی کچەکە هاتە دەرەوە، خاوەنی ئەسپەکە پێی وت:

"بیستومە داوای ئەسپەکەی منت کردووە بۆ مارەیی کچەکەت، ئێستا هاتووم ئەسپەکەت پێشکەش بکەم!"

باوکی کچەکە بە سەرسامیەوە پرسیاری کرد، ئەویش تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوەو وتی:

من لەبەر مەردایەتی ئەم لاوە ئەسپەکەم دەبەخشم بە تۆ.

باوکی کچەکە وتی: "ئەم لاوە پیاوەتیەکی نواندووە، دوای ئەوەی گەیشتۆتە مەرامی خۆی ، بۆ ئەوەی ڕێگەی خێرو چاکە بەردەوام بێت ، چاوپۆشی لە مەرامو ئامانجەکەی کردووە، تۆیش ئەوپەڕی مەردایەتیت نواندووە ئەسپەکەی خۆتت بەخشیوە، دەبێت منیش هەمان مەردایەتی نیشان بدەمەوە، ئەسپەکە بۆ تۆ بگەڕێنمەوەو کچەکەشم پێشکەش بەم کوڕە مەردە بکەم."

"چارلز دیکنیز" دەڵێت:

باشترین خەسڵەتی مرۆیی، مەردایەتیە...

ڕازی ئارامیی ئەمەیە بەسەر
دوژمنی دەرونی خۆتدا زاڵ بیت
نەوەك سەرکوتی بکەیت.

"جۆنسی مکسول"

رازی ئارامیی دەرون

ڕازی ئـارامی دەرون خـۆ ویسـتنە، وزەکـانی خـۆت بـلاوە پـێ مەکـە، بیانخە ژێر چاودێریەوە بەسودەوە هەنگاو هەڵبگرە.

ڕازی ئـارامی دەرون، لەمەدایـە، کارەکانـت بەسـەلیقەو حەوسـەڵەوە ئەنجام بدەیت.

ڕازی ئارامی دەرون، ژیان کردنە لەم ساتە وەختـەدا، رابـردوو ئاینـدە لە خولی زەینی هەتاییدا ڕەها بکەیت.

ڕازی ئارامی دەرون، لە ئاسودەیی دەروندایە. ئاسودەیی جەسـتەیی، سۆزداریی، زەینیو پاشان مەعنەوی.

ڕازی ئـارامی دەرون، دانەخسـتنی دەرگـای دڵـە، ئەمـە بزانـە کـە هەقیقەتو هیچ شتێكو هیچ کەسێك پەیوەست نیە بەتۆوە.

ڕازی ئـارامی دەرون، لـە شـادیدایە، بـیرو ئەندیشـەی شـادی ئـامێز بپارێزە.

ڕازی ئـارامی دەرون لەنـەبوونی ئارەزوەکانـە، ئەمـە بزانـە شـادی لـە

دەرونی تۆدایە، نەك لەدەرەوە.

ڕازی ئـارامی دەرون، لەمەدایـە هـەموو شـتێك وەك ئـەوەی هەیـە پەسەندی بکەیت، پاشان بە هیواو ئارامیەوە هەنگاوی بۆ هەلگریت.

ڕازی ئارامی دەرون تێگەیشتنە لەوەی کە تۆ ناتوانیت دنیا بگۆڕیت، بەلام دەتوانیت خۆت بگۆڕیت.

ڕازی ئـارامی دەرون، هاوڕێیـەتی کەسـانی ئەرێنیـە، لـە تێکـەلاوی کەسانی نەرێنی دورە پەرێزبە.

ڕازی ئارامی دەرون، دۆزینەوەی ئارامیە لە چوارچێوەی خۆت.

ڕازی ئـارامی دەرون، لـە ژیـانێکی سـادەدایە. هـەموو ڕۆژێـك وەرزش بکە، خواردنی گونجاو بخۆ هەناسەی قوولّ هەلّمژە.

ڕازی ئـارامی دەرون، لـــە هـــەبوونی ویـــژدانێکی پاکدایـــە، لەســـەر ئامانجەکانت سوربە.

ڕازی ئـارامی دەرون، لـەرەفتاری ڕەهادایـە، ڕەفتارێـك هـەلّقولاوی ڕاستیەکان بێت، نەك بیرو خەیالّی کەسانیتر.

ڕازی ئارامی دەرون، لەمەدایە لەتێکڕای قۆناغەکانی ژیانـدا پـەیڕەوی لە هەق بکەیت.

ڕازی ئارامی دەرون، لە نەکردنی سکالاّو گلەییدایە، ئەوەی دنیا پێت دەبەخشێت ئەو شتەیە پێشتر تۆ بەووت بەخشیوە.

ڕازی ئارامی دەرون، لەمەدایە کەتۆ هەلّەکانی خۆت ببینیت، بزانیت تەنها خۆت دەتوانیت بیانگۆڕیت بە سەرکەوتن.

ڕازی ئارامی دەرون لە ڕاهێنـانی ئـیرادەی خۆتدایـە، تەنانـەت ئەگـەر

هەناسەکانیشت بەسەختی درێژایەتیت بکەن.

ڕازی ئارامی دەرون، لەمەدایە هەمیشە دڵت خۆش بێت، تەنانەت ئەو کاتەی کەسانیتر گرژو مۆنن.

ڕازی ئـارامی دەرون لەمەدایـە لـەجیاتی ئـەوەی چـاوەڕوان بیـت کەسانیتر دڵخۆشت بکەن، دڵیان خۆش بکەیت.

ڕازی ئارامی دەرون، لەمەدایە خێرو خۆشی کەسانیتر بە خێرو خۆشی خۆت بزانیت.

ڕازی ئـارامی دەرون لـە نەڕەنجانـدنی کەسـانیتردایە، هـەرگیز بـە ئەنقەست کەس مەڕەنجێنە.

ڕازی ئـارامی دەرون، کـار کردنـە لەگـەڵ کەسـانیتر، نـەک لەبەرامبـەر کەسانیتر.

ئەگەر لە نـاخی خۆتـدا ئارامیـت نـەبێت، لـە دنیـای دەرەکیـدا گـەڕان بەدوای ئارامیدا بێ هوودەیە.

"لاروشە فوکالد"

ئەو دەستانەی لە رێی خزمەتتدان
پیرۆزترن لەو لێوانەی هەمیشە نزا دەکەن.

کۆمەك

ساڵی ١٩٧٤ گۆڤاری لایف پۆست، هەواڵی پیاوێکی بڵاو کردەوە کە بۆ شاخەوانی رووی لە شاخەکان کردبوو. لە ناکاو بەفرو بەستەڵەك رێگەیان لێ بەستەوەو سەرەنجام رێگەی وونکرد. ئەو بۆ دۆخێکی بەوجۆرە پۆشاکی گونجاوی پێ نەبوو، دەیزانی هەرچی زوترە دەبێت پەنایەك بدۆزێتەوە ئەگینا سڕ دەبێتو دەمرێت. وێڕای هەوڵو جوڵە کردنەکانی دەستو پێیەکانی لەسەرمادا تەزیین، دەیزانی کاتێکی ئەوتۆی نیە. لەم کاتەدا قاچی بەر کەسێك کەوت بەستبوی لەحاڵەتی مرندا بوو، ئەو دەبوو بریاری خۆی بدات، دەستکێشە تەڕەکانی دەرهێنا لەتەنیشت پیاوە بەستوەکەوە چۆکی دادلو دەستیکرد بە شێلانی. پیاوە بەستوەکە هاتەوە هۆشو جوڵایەوە، ئەوان پێکەوە بە کۆمەکی یەکتریی لەراستیدا کۆمەکی خۆیان دەکرد، تەزیویی گیانیان بە شێلانی جەستەی یەکتریی رەواندەوە.

کتێب دەبێت تەورێک بێت بۆ

شکاندنی بەستەڵەکی وجودمان.

"فرانتس کافکا"

## کتێبخانە

فەرمانڕەوای هیندستان لە کۆشکی خۆیدا کتێبخانەیەکی گەورەی دروست کردبوو، سەد کەسی بۆ ڕێکخستن و پاراستنی کتێبخانەکە دامەزراندبوو. بۆ گواستنەوەی ئەو کتێبانە تەنانەت هەزار وشتر بەشی نەدەکرد. پاشا کاتی بۆ خوێندنەوە نەبوو، چونکە زۆربەی کاتەکانی ئەو لە ڕاو و شکاردا بوو. بۆیە داوای لە داناکان کرد کە باشترین و بەسوودترین بابەت کە لە کتێبەکانی ناو ئەو کتێبخانەیەی ئەودا هەیە لەچەند دەستەیەکدا بۆی کورت بکەنەوە، داناکان بیست ساڵی ڕەبەق کاریان کرد تا داخوازی پاشا جێبەجێ بکەن. پاشان توانیان لە دوو توێی دوو هەزار کتێبدا کورتی بکەنەوە و پاشان ئەنجامی کارەکەیان پێشکەش بە پاشا بکەن کە نزیکەی باری سی وشتر دەبێت، بەڵام وتیان پاشا ئەمە بە زۆر دەزانێت، چەند جارێک تاو توێیان کرد سەرەنجام کردیانە باری دوو وشتر. بەڵام پاشا لەو باوەڕەدا بوو کتێبەکان هێشتا وەکو پێویست کورت نەکراونەتەوە. بەدرێژایی ئەم ساڵانە نەک هەر داناکان بەڵکو پاشا پیر بوون، چیتر پاشا دڵنیا نەبوو هێندە دەژی کە بتوانێت ئەو کورتەیە بخوێنێتەوە، سەرەنجام بەسەرهاتی خۆی بۆ حەکیمێک گێڕایەوە کە چەند ڕۆژێک میوانی دەرباری ئەو بوو، حەکیمە پێی وت: "خاوەنشکۆ، هەرچەن

من ئەو کتێبخانە مەزنەی تۆم نەدیتوە، بەڵام لەخۆم رادەبینم جۆرێك بۆت کورت بکەمەوە تۆ چەند خولەکێکی دیکە دەتوانیت بیخوێنیتەوەو هەتا لە یاندا بیت بیری لێ بکەیتەوە.

پاشان فەرمانیدا قەڵەمو کاغەزی بۆ بێنن ئەم وانەیەی نوسیەوە:

- ئەو جێیەی ڕێگەی نیە، خودا ڕێگەی بۆ دەکاتەوە.
- بەسوودبە بۆ خەڵکی، ئەگەر ناتوانیت، لانیکەم ئازاریان مەدە.
- ئەو کەسەی لە ناخی خۆیدا ئاگرەکەی کوژابێتەوە، ناتوانێت کەسانیتر گەرم بکاتەوە.
- بۆ دەسکەوتنی ئارامی دەرونی، ڕۆح بدە بەسەر جەستەدا، نەك جەستە بەسەر رۆحدا.

لە تەزکیرە ئەولیادا هاتووە، لە گەنجینەکەی شاپور مەلەکدا چەند تابلۆیەکی زێڕین دۆزراوەتەوە ئەمانەی لێ نوسراوە:

- هەر کەسێك ڕۆژگار فێریی دانایی نەکات، هیچ دانایەك ناتوانێ هەوڵی دانایی لەگەڵ بدات.
- هەر پیاوێك داناییەکەی زاڵ نەبێت بەسەر ئاکارو ڕەفتاریدا لە گەل چوار پێدا جیاوازییەکی نیە.
- هەر کەسێك مایەی سودو بەرژەوەندی کەسانیتر نەبێت، لە پێڕی زیندواندا نیەو لە پێڕی مردواندایە.
- خراپەکارێکی خاکەڕا باشترو بەنرخترە لە زاهیدێکی لوتبەرز.

بەختەوەر ئەو کەسەیە یەکێك لەم دوانەی هەبێت:
یان کتێبی چاك، یان ئەهلی کتێب هاوڕێی بێت. "ڤیکتۆر هۆگۆ"

سەگی بێدار، باشترە لە شێری خەوتوو
"پەندی فەرەنسی"

بێداریی

قوتابیـــەك ســـاڵانێك خوێنـــدبوی مەشـــقو ڕاهێنانـــە ڕۆحیـــەكانی ئەنجامـــدابوو، بـــە مامۆســـتاكەی وت بەگومانـــە لـــەوەی كاتێـــك بگاتـــە گەشبینی.

مامۆستا وتی:

"گەشبینی، وەكو خۆركەوتنە، لە تاریكی شەودا دادەنیشیو بێجگە لە چاوەڕوانی خۆركەوتن كارێكت لێ ناوەشێتەوە. شـەو بـەلای هەندێكـەوە كورتو بە بـڕوای هەنـدێكی دیكـە درێـژترە، بـەلام سـەرەنجام خـۆر هـەر هەڵدێت.."

قوتابی باش تێنەگەیشتبوو، پرسی: "ئەگەر خۆر لەهەموو حاڵەتێكدا بكەوێت، ئیدی ئەم هەموو ڕاهێنانە چ سوودێكی هەیە؟"

مامۆستا وتی: "ئەنجامدانی مەشقەكان بۆ ئامادە بوونی تۆیـە، كاتـێ كە خۆر كەوت بێدار بیت!"

مرۆڤەكان دوو دەستەن:

دەستەی یەكەم لە تاریكیدا بێدارن، ئەویتریان لە ڕوناكیدا خەوتوون.
"جوبران خەلیل"

## خەڵکی لەسەر ئاینی ڕێبەران و پێشەواکانی خۆیانن.

### لاوی ستەمکار

دەگێرنەوە کە: خەڵکی ڕێبەران دەکەنە سەرمەشقی خۆیان. ئەگەر ڕێبەر دادوەرو چاکەکار بێت، خەڵکیش ڕوو لە دادگەری و چاکەخوازی دەکەن، ئەگەر ستەمکارو خوێنمژ بێت، ئەوانیش ڕوو لە خراپەکاری دەکەن و دەیکەنە سەرمەشقی خۆیان، لەم چیرۆکە ڕامێنن:

سەردەمێك لە نێوان ناپلیۆن پاشای فەرەنساو دەوڵەتی نەمسا شەڕ ڕویدا، ناپلیۆن یەکێك لەشارە گرنگەکانی ئەو وڵاتەی گەمارۆ داو خەڵکەکەی کەوتنە مەترسیەوە، سەرەنجام ئەوان لە تاو برسێتی و قاتو قڕی خۆیان دابە دەستەوە، ناپلیۆن بە سوپاکەیەوە هاتە نێو شارەکەوە، ناپلیۆن فەرمانیدا هیچ کەسێك مافی ئەوەی نیە ستەمیان لێ بکات وماڵیان تاڵان بکات، ژیانی هەمویان پارێزراوە، دوای دەرچونی ئەم بڕیارە هەرکەس سەرگەرمی کاری خۆی بویەوە.

ڕۆژێك پیاوێکی گوندنشین چەند مریشکێکی هێنا بۆ شار بۆ ئەوەی بیفرۆشێت و خواردنێکی پێ بکرێت، کە گەیشتە دەروازەی شار، سەربازێکی فەرەنسی مریشکێکی لێ سەند، جوتیارەکە داوای پارەی

مریشکەکەی لێکرد، سەربازە فەرنسیەکە وتی پارەم پێ نیە، دەبێت ئەم مریشکە بە خۆرایی بۆ من بێت.

جوتیارەکە وتی: "مەگەر نازانیت کە پاشا فەرمانیداوە ستەم لە هیچ کەسێك نەکرێت؟"

سەربازەکە وتی: "تەواوە، بەڵام من هیچ پارەیەکت پێ نادەم!"

جوتیارەکە بە ناچاری رۆشت بۆ بارەگای ناپلیۆن و سکاڵای لەو ستەمە کرد کە لێی کراوە، ناپلیۆن دوای بیستنی بەسەرهاتەکە نیگەران بوو، پێی وت: "ئەو سەربازە دەناسیتەوە؟

" وتی: "گەر بیبینمەوە دەیناسمەوە."

ناپلیۆن فەرمانیدا تێکڕای ئەو سەربازانەی لەدەروازەی شاردا ئێشکچین هەمویان کۆ ببنەوە، فەرمانیان جێبەجێ کردو جوتیارەکە سەربازەکەی ناسیەوە، ناپلیۆن سەربازەکەی بانگ کردو وتی:

"ئایا تۆ مریشکت لەم جوتیارە وەرگرتووەو پارەشت پێ نەداوە؟"

سەرباز وتی: "بەڵێ!"

وتی: "مەگەر فەرمانی منت نەبیستووە؟"

سەرباز وتی: "بیستومە!"

ناپلیۆن وتی: "بۆچی ستەمت کرد؟"

سەرباز وتی: "ئەم مەسەلەیەت بە چپەوە تێ دەگەیەنم!"

ناپلیۆن وتی: "پێم بڵێ"

سەرباز، سەری بردە بناگوێی ناپلیۆن و وتی:

"خاوەنشکۆ، ئایا کە تۆ ئەم شارەت بە ڕەق و ستەمەوە داگیر کرد،

هەزاران کەست لەناو برد،ماڵی باوکت بوو؟"

ناپلیۆن وتی: "نەخێر!"

سەرباز وتی: "ئایا ئەم خەڵکە بەدبەختە دەسدرێژیان کردبووە سەر دەوڵەتو میلەتی فەرەنسا؟"

وتی: "نەخێر!"

سەرباز وتی: "ئەی بە چ هەقێك ئەو ستەمەت لەوان کردو ئەم رۆژە رەشەت بەسەردا هێنان؟" وتی: "بە یاسای رۆژ!"

سەربازەکە وتی: "منیش بە پێی ئەو یاسایە، ئەو مریشکەم لەو جوتیارە وەرگرت!"

ناپلیۆن کە وەڵامێکی پێنەبوو وتی:

"چیتر پەیڕەوی لەو یاسایە مەکە."

ئەوی ئازاد کردو پاشان خەڵاتی جوتیارەکەی کرد.

ئەوانەی بە چاو کراوەیی لە پرسەکان دەڕوانن
گرێکوێرەکان بەدەستی خۆیان دەکەنەوە
ئەوانەی چاویان لە ئاست راستیەکان دەبەستن بێجگە
لە کوێر کردنەوەی گرێکان هیچیان لەدەست نایەت

هێزی جیاکردنەوە

ئایا تا ئێستا دەربارەی بۆق ئەم ئاژەڵە دوو ژینگەیە هیچ دەزانیت، ئایا تا ئێستا لەچاوەکانی ورد بویتەوە، سەرنجی ئاکارو ڕەفتاریت داوە؟ ئایا ڕاوکردنی بۆقت دیتوە، دەزانیت چۆن سکی خۆی تێر دەکات؟

بۆق، بۆ خۆراکی خۆی سوود لە گیانەوەرە وردەکان دەبینێت، بۆیە هەمیشە لە کەمیندایەو لە سەر ڕێگای ئەو گیانەوەرانەدا داو دەنێتەوە بەڵکو چەند گیانەوەرێك لەداوی ئەو بکەوون سکی خۆی پێیان تێر دەکاتو شەوانیش ئاوازی خۆی دەچرێت.

چاوەکانی بۆق هەمیشە ئامادەیە بۆ ڕاوو شکار. کرداری چاوەکانی بۆق سەیرو سەمەرەیە، چونکە توانای جیاکردنەوەی ئەو گیانەوەرانەی هەیە کە دەجولێنو ئەملاولا دەکەن، ئەو شتانەی ناجولێنو وەستاوون

گوێیان پێنادات!

ڕونتر، بەلای بۆقەوە تەنها ئەو بونەوەرانە شایەنی ڕاو کردنن لە جوڵەدا بن، تەنها لەکاتی جوڵەدا دەچێت بۆیان، بەدەر لەمە گوێ بە هیچ شتێکی دیکە نادات. پاشان چاوەکانی تەنها گیانەوەری جوڵاو دەبینێت، ئەمەش بەو مانایەیە ئەگەر قاپێکی پڕ لە گیانەوەری بێ جوڵەو وەستاو بخرێتە بەردەمی، ڕەنگە لە برساندا بمرێت، لە کاتێکا قاپێکی پڕ لەخۆراک لەبەردەمیدا دانرابێت!

ئەمیشە کۆمەڵە شتێکمان بۆ دانراوە، کە ئێمە نایانبینین
ئەگەر بتوانین ئەوەی بەراستی بۆمان دانراوە ببینین
کەمتر پەلە قاژێی ئەملاو ئەولا دەکەین.

ئەو رۆژەی مرۆڤ پەی بە نەزانی خۆی دەبات سەرکەوتنی گەورە مسۆگەر دەکات، چونکە دانایی لەم دنیایەدا شتێك نیە بێجگە لە پەی بردن بە نادانی نەبێت.

"مۆریس میتر لینگ"

ئەستێرە ناسی

خواجە نەسرەدین توسی، لەسەفەرێکدا دەمەو ئێوارەیەك لە رێگا گەیشتە ئاشێك، وەرزی بەهار بوو، هەوایەکی لەباری هەبوو، لەوێ خورجینەکەی داناو پاڵی لێدایەوە پشویەك بدات، لەم کاتەدا ئاشەوان کە پیرەمێردێك بوو بەسەرو سیمایەکی ئارداویەوە لەپلیکانەی ئاشەکە هاتە خوارەوە، کە خواجەی بینی دوای سڵاوو هەواڵپرسی، پێی وت: "برادەر، پێم وایە ئەمشەو بارانێکی بەخوڕ دەبارێت، باشترە بارگەو بنەت بێنیتە ناو ئاشەکەو میوانی من بیت، ئاوا ئاسودەتر دەبیت."

خواجە بیری کردەوە، وەرزی بەهارەو هەوایەکی خۆشی هەیە، خەوتن لە نێوئاشو دەنگو هارەی ئاشو ئارداوی بوونو هارەی ئاش شتێکی خۆش نیە." سوپاسی پیرەمێردی کردو وتی:

"هەر لێرە حەز دەکەم پشوو بدەمو بخەووم، هەوا ئەمڕۆ ساماڵ بوو، هیچ ئەگەرێکی باران بارین نیە!"

ئاشەوانەکە دوبارە وتی:

"ڕێبواری ئازیز! بارانێکی بەتین دەبارێت، نیوە شەو ناچار دەبێت پەنا بێنیت بۆ ئاشەکە، بەڵام لەو کاتەدا من خەوتووم و گوێم گرانەو دەنگو هاڕەی ئاشەکەش بەهێزە، هەرچەن لە دەرگا بدەیت و هاوار بکەیت، من هیچ نابیستم، شەوانەش کە دەخەووم ٢٥ مەن گەنم لە پشتی دەرگاکەوە دادەنێم بۆ ئەوەی دەرگاکە بە باشی کۆڵۆم بێت، باشتر وایە هەر ئێستا لەگەڵ من بێیتە ئاشەکەوەو شەو لەوێ بیت.

خواجە سەیرێکی ئاسمانی کردو سەعات و ڕۆژ ژمێرەکەی لە باخەڵی دەرهێناو لێی ورد بویەوە هیچ بەڵگەیەکی باران بارینی نەدۆزیەوە.

لە هەوای ئەو ڕۆژەدا هیچ نیشانەیەکی باران بارین نەبوو، بەکورتی هەرچی زانیاریەکی لەبارەی زانستی ئەستێرەناسی و جوگرافیاوە ئەزمونەکانەوە خوێندبوو، پشتراستی ئەم گومانەی نەدەکردەوە، بۆیە پێشبینی کرد کە هەوا ساف و بێگەردە، دوبارە پۆزشی بۆ پیرەمێرد هێنایەوە، پیرەمێرد چیتر جەختی نەکردەوە ڕۆشتە ژورەوە دەرگای داخست و لێی خەوت، نیوەی شەو تێپەڕی بوو، کاتێ خواجە ویستی بخەوێت، لە پڕ هەستی بە گۆڕینی هەوا کرد، هێشتا لە خەیاڵی ئەو گفتوگۆیەی نێوان خۆی و پیرەمێرد بوو، دەنگی هەورو بروسکە لە ئاسمانەوە بەرز بویەوە، بارانێکی بەخوڕ بەتەرزەوە دایڕشت.

خواجە بەپەلە خۆی گەیاندە لای دەرگای ئاشەکە، هەرچەن دەرگای کوتاو هاواری کرد، پیرمێردی ئاشەوان ئاگای لێ نەبوو، بارو بنەی خواجە لەباران و تەرزەدا خوسا، خواجە ئەو شەوە دوای خۆشکردنەوەی بارانەکە

لە سەرماو نارەحەتیدا ڕۆژی کردەوە.

سبەی بەیانی زوو پیرەمێرد کە دەرگای کردەوە هاتە دەرەوە خواجەی بەو حاڵەوە بینی پێکەنی وتی:

"ڕێبواری ئازیز! گوێت لە قسەی پیر نەگرتو ئەنجامەکەت بینی!"

خواجە وتی:

"پیری ئازیز! دەبێت بڵێم کە من ئەستێرەناسمو کتێبم لەم بارەیەوە نوسیوە، دوێنێ شەو ئەوەی من دەمزانی هیچ یەکێك بەڵگەی بارینی نەدەدا بەدەستەوە. بەڵام ئێستا پرسیارێکم هەیە، تۆ چۆن دەتزانی باران دەبارێت؟"

پیرەمێرد وتی:

"من ئەزمونم هەیە، دوێنێ بەیانی، کەناری ئاسمان کەمێ سور بوو، لەم حاڵەدا ئێمەی گوندنشین دەزانین بارانێك بەڕێوەیە، بەڵام بەدەر لەوەش سەگێکم هەیە ساڵانێکە لەم ئاشەدا دەخەوێت، ئەو شەوەی ئەگەری بارین هەبێت دێتە ئاشەکەوە لەلای دەرگاکەوە سەری دەخاتە سەر دەستی خۆیو دەخەوێت."

دوێنێ عەسر وایکرد، منیش لەم کاتەدا بە پێی ئەزمون دەزانم ئەمشەو باران دەبارێت، من لەسەگەکەم دڵنیامو هەر بۆیە دوێنێ شەو جەختم کردەوە کە تۆ بێیتە ژورەوە!"

خواجە کەمێك بیری کردەوە سەرێکی لەقاند، پاشان ئەو نوسراوەی دەربارەی ئەستێرەناسیو کەشناسی نوسی بووی لەخورجینەکەی دەرهێناو پەڕە پەڕەی کردو پاشان یەك بەیەکی شۆردەوەو ئەنجا دای

بەدەم باوەو وتی: "داناییەك دوای ساڵانێك لەبەر دوكەڵی چرادا فێر بوبێت، بنیادەمێك بە ئەندازەی سەگێك لە مەقیقەت نزیك نەكاتەوە، هەرشایانی بەدەم باوەدانەوە!"

"جۆرج تایلر" دەڵێت:

بابی بوون لە دانایی خۆت، بەدترین جۆری داناییە.

"هالی تربون" دەڵێت:

دانایی بەبێ كامڵبونی ئەخلاقی، مەترسیدارو فەوتێنەرە.

دانا ئەركی خۆی ناكاتە هۆی بزێویی ژیان
بەڵكو ئەرك لای ئەو ئامانجی ژیانە.

"كۆنفۆشیوس"

### دەردە سەریی

پیرەمێردێك ساڵانێك بە مەبەستی زیارەتی شوێنە پیرۆزەكان لەسەفەردا بوو، ڕۆژێك بە كەناری ڕوبارێكدا دەڕۆشت، كاتێ سەیری ئەوبەری ڕوبارەكەی كرد، بینی بەستێنی ئەوبەر نەرمو خۆشترە ڕۆشتن بەو بەستێنەدا ئاسانتر دەردەكەوێ. لە دڵی خۆیدا وتی:

"دەبێ بڕۆمە ئەوبەری ڕوبارەكەوە." بیری كردەوە لە لقو داری درەختەكان بەلەمێك دروست بكات، هەر ئەمەشی كرد. پاشان بەلەمی خستە ئاوەكەو پەڕیەوە بۆ ئەوبەری ڕوبارەكە. هەركە بەلەمەكەی هێنایە دەرەوە بیری كردەوە: "بەراستی ئەم بەلەمە بۆ من بەسود بوو،

بەزەحمەتێکی زۆر دروستم کرد، ناتوانم لێرە بەجێی بێڵم دەبێ بیبەم لەگەڵ خۆمدا."

بەلەمەکەی بەدوای خۆیدا کێش کرد، بۆ هەر جێیەک دەچوو دەیبرد لەگەڵ خۆی، لە هەر شوێنێك ماندوو دەبوو دەیکردە کۆڵ، تا وای لێهات رۆشتن لەوبەری روبارەکەوە دژوارترو سەختتر بوو لە ڕێگەی یەکەمجار.

سەرنج:

ئەو کاتە دێتە پێشەوە تەنانەت ئەو شتەی سوودێکی زۆری هەیە بۆمان، چیتر پێویستمان پێی نابێتو دەردەسەریمان بۆ دەسازێنێ، دەبێت ئەو شتەی پێویستمان پێی نیە ڕەهای بکەین، چونکە لە پێمان دەخات.

ئەو ڕۆژەی کە هەموو بە دوای چاوی جوانەوەن.
تۆ بە دوای "نیگای جوان"ەوە بە.

"عەلی شەریعەتی"

## بەمجۆرە بڕوانە

پیاو، بە ئەقڵی نەک بەسەروەتەکەی

ژن، بە وەفاداری نەک بە جوانیەکەی

دۆست، بە خۆشەویستی نەک بە قسەکانی

عاشق، بە خۆڕاگریی نەک بە بانگەشە

سەروەت، بە بەرەکەت نەک بە بڕەکەی

ماڵ، بە ئارامیەکەی نەک بە ئەندازەکەی

ئۆتۆمبێل، بە کارابیەکەی نەک بە مۆدێل

خواردن، بە چۆنێتی نەک بە چەندێتی

وانە، بە مامۆستاکەی نەک بە قورسیەکەی

زانا، بە زانستەکەی نەک بە بڕوانامەکەی

بەڕێوبەر، بە کردارەکەی نەک بە پۆستەکەی

نوسەر، بە بیرو باوەڕەکەی نەک بە ژمارەی کتێبەکانی

کەس، بە مرۆڤایەتیەکەی نەک بە ڕواڵەت

دڵ، بە پاکیەکەی نەک بە خاوەنەکەی

جەستە، بە ساغیەکەی نەک بە لاوازیی

قسە، بە قوڵی ماناکەی نەک بە بێژەرەکەی

ئەگەر مەرگ بۆخۆت ئاسان بکەیت

خودی مەرگیش هەراسان دەکەی

"فیردەوسی"

**ململانێی ئازار**

ژنێك لە مردنی تاقە کوڕەکەی زۆر پەرێشان بوو، ئەو نەیدەتوانی بەرگەی مەرگی تاقانەکەی بگرێت، بەهەموو لایەکدا دەرۆشت تاکو دەرمانێك بدۆزێتەوە بەڵکو ژیانی بۆ بگێڕێتەوە، حەکیمێکیان پێ ووت کە دەرمانی لایە.

ژنەکە چووە لای حەکیمەکەو پێی وت:

"ئایا دەتوانیت دەرمانێك دروست بکەیت کوڕەکەم زیندو بێتەوە؟"

حەکیم وتی: " ئەو دەرمانە دەزانم، بەڵام بۆ ئەوەی دروستی بکەم پێویستم بە چەند شتێك هەیە."

ژنەکە هێور بوبویەوە وتی :

"پێویستت بەچی هەیە؟"

حەکیم وتی :"پێویستم بە مشتێك تۆوی خەردەل هەیە."

ژنەکە بەڵێنی پێدا بۆی پەیدا بکات، حەکیم وتی: "من پێویستم بە تۆوی خەردەلێکە لەلایەن خێزانێکەوە ئامادە کرابێت کەتێیدا هیچ هاوسەرو دایكو باوكو خزمەتکارێك نەمردبێت."

ژنەکە قایل بوو، دەستی کرد بەگەڕانو لەهەموو دەرگایەکیدا بەڵکو

کۆمەکی بکەن، کاتێ ژنەکە پرسیاری دەکرد کەئایا لەم خێزانەدا کەسێك مردووە نەیتوانی خێزانێك بدۆزێتەوە کەسێکی تێدا نەمردبێت. نەیتوانی ماڵێك بدۆزێتەوە مەرگ پەی پێی نەبردبێت. بۆیە بە نائومێدی گەڕایەوە بۆ لای حەکیم، حەکیم بە دڵنەوایی کردنەوە پێی وت: "تۆ واتدەزانی هەر تۆ کوڕەکەت لەدەستداوە؟ یاسای مەرگ بۆ هیچ کەسێکی زیندوو، نەمریی پێ پەسەند نیە."

خاتو "بتی جین" دەربارەی مەرگ دەڵێت:

ئێوە نامرن، ناچنە ژێر گڵەوە

دەچنە ئامێزی نورەوە، ئامێزی خودا!

"لیۆ بوسکالیا" مەرگ بە هاوپەیمانی ژیان دەزانێت دەڵێت:

مەرگ، مەزنترین هاوپەیمانی ژیانە

مەرگ پێمان دەڵێت ئێستا ژیانو لەم ساتەوەختەدا

دەبێ بژیت، سبەی نادیارەو ڕەنگە هەر نەیەت،

دەزانین بۆ هەتایی کاتمان نیە.

مەرگ فێرمان دەکات، بڕوانینو ببینین

ئەوانەی خۆشمان دەوێن هەمیشە وەك خۆیان نامێننەوە

ئێوە بۆ هەتایە لەدنیادا نابنو نامێننەوە.

وەك هەمان ئەڵقەیە کەعبە شایانی پەرستنە
ئەو چاوەی نیگایەکی هەوەسبازیی نەکردووە
"صائیبی تەبریزی"

ئەو موریدەی هیچ نەبوو

موریدێك کە چەندین ساڵ تەریقەتی تەی کردبوو، ڕەنجێکی زۆری کێشا بوو، بە پیری تەریقەتەکەی خۆی وت: "ئێستا من دەتوانم سەرپەرشتی کۆمەڵێك بم، ئەگەر تۆ مۆڵەتم بدەیت سەفەرەکەم دەست پێ بکەم."

پیر وتی: "تۆ هێشتا ئامادەو پوختەکراو نیت."

مورید وتی: "گەر مۆڵەت بفەرموی من ئامادەم."

هێندە جەختی کردەوە پیر وتی: "زۆر باشە بەلام بەو مەرجەی کەمێك توێشوو هەڵگریتو بە پێی پەتی بە بیاباندا برۆیت تاکو دەگەیتە ئاوەدانی."

موریدەکە پەسەندی کردو بە فەرمانی پیر کەوتە ڕێ، چەند رۆژێ دواتر ... توێشوەکەی تەواو بوو، تینوێتیو برسێتی زۆریان بۆ هێناو برستیان لێ بڕی، لە پڕ تارماییەکی لە دوورەوە بەدی کرد، زۆری لەخۆی کرد هەرچی زوترە بگاتە ئەو تارماییە.

کەمێك دواتر، گەیشتە باخێك بەشێك لە دیوارەکانی داڕوخاوو ناوەکەی پڕ لە درەختی میوە بوو. گەیشتە بەر دەرگاو ویستی لێی بدات، بەلام لێی نەداو لە دیوارە ڕوخاوەکەوە چووە ناو باخەکەوە، چاوی بە سێوی نەگەیوو کەوت بە پەلە کەوتە لێکردنەوەی سێوەکانو هەریەکەو

گازێکی لێ دەگرت‌و فڕێی دەدا، هێندە بەردەوام بوو تا تێر بوو، لەم کاتەدا گەیشتە ناوەڕاستی باخەکە حەوزو بیرو ئاوو تەلارێکی جوان‌و نەشەنگی بینی، لە ئاسمان ورد بویەوە زانی کاتی نوێژە. ئاوی لە بیرەکە هەڵگوزی‌و خەریکی دەسنوێژ گرتن بوو کە چاوی بە ژنێکی جوان کەوت لە هەیوانی تەلارەکەوە وەستا بوو، بۆ چەند ساتێك لێی ورد بویەوە، پاشان دەستی کرد بە نوێژ کردن، دوای تەواو بوونی نوێژەکە دوبارە چاوی بڕیەوە ژنەکەو وتی: "تۆ کێیت؟"

ژنەکە وتی: "تۆ کێیت؟"

مورید وتی: " من موریدی فلانە عاریفی ناودارم."

ژنەکە پێکەنینێکی گاڵتە ئامێزی کردو وتی: " نەخێر تۆ هیچ کام لەوانەی کە وتت ئەو کەسە نیت!"

مورید بە سەرسوڕمانەوە لە ژنەکەی ڕوانی، ژنەکە وتی: "ئەڵێی لە شوێنێکی دورەوە هاتویت، وامزانی ڕێبوارێکی ڕێگەت وون کردووە، پێویستت بە هاوکاریە، چونکە تۆ لە دەرگات نەداو لە دیوارەوە هاتویتە ناو باخەکەوە، دەزانم بێکارو دەسدرێژیکەریت، بەوەی سێوەکانت نیوە خواردو کردو فڕێتدان، واتا شێتێکی تەواویت، پاشان مایتەوەو چاووت بڕیە منو لێم وردبویتەوە، تۆ نە موریدیت نەدەروێش، ئەنجا کە نوێژت کرد وامزانی سۆفیت، کەچی دوای نوێژەکەت دوبارە چاووت تێبڕیمەوە، دیارە کە سۆفیش نیت، ئێستا دەزانیت کە تۆ چیت؟"

موریدەکە سەری داخست‌و بەرەو شوێنی خۆی گەڕایەوە بۆ لای پیری تەریقەتەکەی پێی وت: "ئەی پیر، فێرم بکە کە من هیچ نیم!"

بۆ پێشکەوتن سێ شت پێویستە
یەکەم سوربون، دووەم سور بون،
سێیەم سور بون.

"لۆرد ئاویبوری"

سوربون جادوو دەکات

فرۆشیارێکی لاو، سەرەنجام لە نوسینگەی سەرۆکەوە پەسەند کرا، سەرۆک پێی وت: "ئەی لاو، تۆ دەبێت دڵخۆش بیت کەمن لێرە پەسەندم کردیت. بەر لە تۆ پێنج کەسم ڕەت کردۆتەوە."

فرۆشیاری لاو وتی: "دەزانم گەورەم، هەر پێنجیان من بووم!"

ئاوێك کە بە بەردەوامی تنۆك تنۆك دەتکێتە سەر تاشە بەردو کونی دەکات، مشك بە سوربونو بەردەوامبون دەتوانێ ڕشتەیەکی بەهێزی سیم بقرتێنێ، لێدانی بەردەوامی تەورێکی بچوك درەختێکی کۆنە ساڵ لە بن دێنێت.

"بنیامین فرانکلین"

شێت دەڵێت من ئابراهام لینکۆڵنم
کەسی تورە دەڵێت: بریا، من ئابراهام لینکۆڵن بومایە
کەسی ساغیش دەڵێت: من منم، تۆ تۆیت.

"فریدریك پرلز"

من، منم!

من تەلارسازم، کۆشکی بەرزم دروست کردووە، هەر ساڵێك دەچمە ناو قوتابخانەیە، تویژێکی دیکەی دانایی‌و ژیریی بۆ زیاد دەکەم.

من پەیکەرتاشم، خوو نەریتی فیکریم بە خۆڵ‌و گڵی باش‌و خراپ دروستکردوە.

من وێنە کێشم، بەهەر بیرۆکەیەکی نوێ، پەردەی رەنگێکی نوێ بۆ رەنگەکانی دنیا زیاد دەکەم.

من دانام، هەر رۆژێك تێدەپەڕێت زانیاری نوێ بەدەست دێنم. چەمك‌و تێڕوانینی نوێ ئەزمون دەکەم.

من پزیشکم، ئەو کەسانەی بۆ چارەسەرو راوێژ دێنە لای من شیفایان پێ دەبەخشم.

من پارێزەرم، لە داکۆکی لە مافی کەسانیترو خۆم بێزار نابم.

من ئەفسەری پۆلیسم، هەمیشە چاودێری ئارامی‌و ئاسودەیی خەڵکی دەکەم.

من مامۆستام، بە نمونەکانم کەسانیتر گرنگی لە خۆبوردن‌و

سەختکۆشی فێر دەبن.

من بیرکایزانم، دڵنیام بۆ هەر یەکێك لە گرفتەکانم ڕێچارێکی گونجاو دەدۆزمەوە.

من شاخەوانم، بەئارامی بەڵام بەردەوام بەرەو لوتکە هەڵدەکشێم.

من ملیۆنێرم، سەرشار لە گەنجینەی عەشق، سۆزو خۆشەویستی، خاوەن سەرمایەی زانیاری، ژیریی، ئەزمون و شتە بەهادارەکان، لەهەموویان گرنگتر، من، منم.

نیو کیلۆیە، بەڵام خۆتبە!

رازی سەرکەوتنی من ئەمەیە، لە یەك کاتدا تەنها بیر لە بابەتێك دەکەمەوە.

"چارلز دیکنز"

تەرکیز واتا...

پیاوێکی تیروکەوان ساز، لە یەکێك لە گوندەکانی هیندستان دەژیا، ڕۆژێك لەکاتی دروستکردنو وردبونەوەی تیر ، سوپای پاشا بەوێدا نیپەڕینو ئەو بەهیچ جۆرێك ئاگای لێیان نەبوو تەماشای نەکردن.

"داتا تریا" یەکێك لە پیاوماقوڵانی گوندەکە ئەم دیمەنەی دیبوو، لە تیرسازەکەی پرسی:

"ئایا تۆ سوپای پاشات نەبینی؟"

ئەو وتی: "کام سوپا؟"

"داتا تریا" دەستبەجێ لەبەرامبەریدا تەعزیمی کردو وتی:

"تۆ مورشیدی منیت."

سەرنج:

لە جیاتی ئەوەی لە یەك کاتدا چەند کارێك پێکەوە ئەنجام بدەیت، تەرکیز لەسەر ئەنجامدانی یەك کار بکەرەوەو بەدروستی ئەنجامی بدە.

چڕ بوونەوە "تەرکیز" واتا قوربانی کردنی تێکرای کارەکان، واتا هەموو بیرکردنەوەکانت، تێکرای هەستو سۆزەکانت، ورەو تینی دەرونیت لە یەك ئاراستەدا بخەیتە کار.

"مارك فیشەر"

**بانگەواز**

رۆژێک مەلای مەشهور بەناو شاردا بانگەوازێکی بڵاو کردەوە کە خەلیفە نانخواردن بە هەموو خەڵکی شار دەدات، خەڵکی هەموو بەپەلە کەوتنە خۆ بە قاپو مەنجەڵەوە بەرەو کۆشکی خەلیفە رێکەوتن. مەلا سەرسام بوو، ساتێ دانیشتو بیری کردەوە پاشان خۆیشی مەنجەڵێکی هەلگرتو لەگەڵ خەڵکەکە تێکەڵ بوو. یەکێک لە دۆستەکانی بە مەلای وت: "مەلا، تۆ بۆ کوێ دەرۆیت؟ تۆ خۆت دەزانی درۆت کردووە؟" مەلا بەدەم راکردنی بەدوای خەڵکەوە: "کێ ئەڵێ خەلیفە خواردن دەبەخشێتەوە، لە کۆنەوە دەڵێن: تاکو شتێک نەبێت خەڵک لە خۆیانەوە قسە ناکەن."

**سەرنج:**

باوەڕکردن بە درۆیەک کە چەندینجار دوبارە بۆتەوە، زۆر ئاسانترە لە راستیەکی شاراوە کە هەرگیز روونەدلوە."

## نیگەرانی بۆ شتی بچوك
## سێبەری گەورەی دەبێت

"سویدیی"

**لە کایەك کێو دروست مەکە..**

ژن و مێردێك دەیانویست بچن بۆ سەردانی ماڵی خزمێکیان کەچەند کیلۆمەترێك لێیانەوە دوور بوو، لە ڕێگا بیریان کەوتەوە، دەبێت لە پردە کۆنەکەوە نەڕۆن چونکە بەکەڵکی پەڕینەوە نایەت، بە بیرکەوتنەوەی ئەم بابەتە ژنەکە توشی نیگەرانی بوو بە مێردەکەی وت: "من نامەوێ لەو پردەوە بڕۆین، بزانە بەلەمێك نادۆزیتەوە پێی بچینە ئەو بەری ڕوبارەکە؟"

مێردەکەی وتی: "من بیری ئەو پردەم نەبوو، بەراستی ئەو پردە مەترسیدارە، ڕەنگە کاتێ بەسەریدا دەڕۆین بروخێت و بکەوینە ئاوەکەو بخنکێین."

ژنەکە وتی: "باشە، بێت و تۆ بکەویت و قاچت بشکێت، ئەو کاتە کێ من و مناڵەکان بەخێو دەکات؟"

مێردەکەی وتی: "نازانم، بێت و من قاچم بشکێت، چیمان بەسەر دێت، ڕەنگە لە برساندا بمرین."

ئەم گفتوگۆیە هێندە بەردەوام بوو، ژن و مێرد هەردوو نیگەران بوون،

هەرچی بەڵاو نەهامەتیە بەسەریاندا بێت، تا سەرەنجام گەیشتنە لای پردەکە، بەڵام بەوپەڕی ناباوەڕی بینیان کە پردێکی تازە دروستکراوەو بەسەلامەتی بەسەریدا پەڕینەوە!

مەهێڵن مۆریانەی نیگەرانی کۆشکی ژیانتان وێران بکات.

"دیل کارنگی"

## خەیاری تاڵ

ڕۆژێک پیاوێک لەگەڵ لوقمانی حەکیمدا بە بیابانێکدا دەڕۆشتن، پیاوەکە خەیارێکی کرد بە دوکەرتەوە، قاژێکی دابە لوقمانی حەکیم، لوقمان دەستی کرد بەخواردنی دەیوت: "چەند خەیارێکی شیرینە! چەند بە لەزەتە!"

هێندە تام و چێژی خەیارەکەی باسکرد پیاوەکەش نیوەکەی دیکەی گاز لێگرت، دەم و چاوی گرژ کرد وتی: خەیارێکی چەند تاڵە!"

بەتوڕەیی وتی: "تۆ دەڵێی چی؟"

لوقمان هەروا باقی خەیارەکەی دەخوارد بە هێمنی وتی: "قوربان هێندە شیرینیم لەدەستی تۆ خوارد، کە شەرمم دەکرد ئەمجارە بڵێم تاڵەو حورمەتی باشیەکانی پێشو بشکێنم!"

**ئەو کەسەی بە پەرۆشەوە بیر لە شیفاو پەرجو دەکاتەوە، بێگومان بۆی ڕوو دەدات.**

**"دبی مور"**

**نەخۆشی**

دۆستێك گێڕایەوە:

پزیشك بە تەنیا بانگی کردمو وتی: "بەداخەوە، وێڕای ئەو نەشتەرگەریەی بۆ هاوسەرەکەت ئەنجامدراوە، بەهۆی کارایی گرێی شێرپەنجەوە، هاوسەرەکەت لە دوسێ مانگ زیاتر ناژی."

هەموو دنیا بەسەرمدا ڕوخا بوو، چ وەڵامێکی منداڵەکان بدەمەوە؟

کەمێك بیرم کردەوە بەخۆمم وت: "ئەم بیرو خەیاڵە نەرێنیە دەبێ لە مێشکمدا بسڕمەوە."

پاشان بوغزی خۆم قووتدایەوە، کەمێك گریام، بەڵام کەس پێی نەزانیم، پاشان بە پێکەنینەوە گەڕامەوە.

لێیان پرسیم:

"بابە، پزیشك وتی چی؟"

من بە خۆشحاڵیەوە وتم:

"هەواڵێکی خۆش، دایە چاك بۆتەوە نەشتەرگەریەکەی سەرکەوتوو بووە، دەبێ ئەمشەو ئاهەنگ بگێڕین!"

پاشان ماچی هاوسەرکەم کردو، هاتینـەوە بـۆ مالـەوە بـەم هەوالـەوە هەموو دۆستو خزمەکانمان کۆ کردەوە بە بیانوی ئاهەنگو چاکبونەوەی هاوسەرەکەم، ئەو شەوەو شەوانی دیکە تێپەڕین... من لەهەموو ئەو ساتە سەختانەدا مـن بـە پەرۆشـەوە نـزام دەکـردو هـەرگیز نەمدەهێشـت بـیرو خەیالی نەرێنی بەمێشکمدا گوزەر بکەن.

ئێستا سالانێك بەسەر ئەو ڕوداوەدا تێپەڕ بووە. وێرای ئەوەی پزیشك وتبوی، هاوسەرەکەم دوسێ مانگی دیکە دەمرێت، سوپاس بۆ خودا ئـەوا دەسالە بەباشیو خۆشی لەگەلماندا ژیان دەکات.

سەرنج:

"جوزیف مۆرفی" بۆ سەلامەتیو شیفا بەخشین دەلێت:

خودا بە تاقانە و دەسەلاتی گەردون بزانە. پـەروەردگار دەسـەلاتێکە لەسەرو هەموو دەسەلاتەکانەوە، لێوانە پاراوییو تـازەییو لـەدلی هـەموو کەسێکدا بوونی هەیە، بیر لەخەسلەتەکانی بکەرەوە.

لێبوردنت لەبەرامبەر هەموو شتێکدا هـەبێت، ئەندێشـەی میهرەبـانی خۆت بەڕوی هەموو کەسێکدا بپرژێنـە، بلـێ مـن ئازادانـە بەوپـەڕی نیـەت پاکیمـەوە لەهـەموو لایـەك خـۆش دەبمو هـەموو کەسـێکم خۆشـدەوێت، دلنیابە شیفا بەخشینی پەروەردگار لە ناخی تۆدا فراوانەو جەستەو ڕۆحت ئارام دەکاتەوە.

ئەو بالایەی بۆ خزمەتی خەلکی دەوەستێت

باشترە لەو بالایەی لە میحرابدا دەچەمێتەوە

بەڕێوەبەری لێزان

ڕێوی: "دەزانی سەعات چەندە، ئاخر سەعاتەکەم خراپ بووە."

شێر: "من بەئاسانی دەتوانم چاکی بکەمەوە."

ڕێوی: "بەڵام پەنجە گەورەکانی تۆ تەنها خراپی دەکات."

شێر: "نا، بێنە با بۆت چاك بکەمەوە."

ڕێوی: "قسەی پروپوچە، هەموو کەرێك دەزانێ شێرێکی تەممەڵ بەو پەنجە گەورانەی ناتوانێ سەعاتێکی دەستی چاك بکاتەوە."

شێر: "دیارە کە دەتوانێ، بێنە با بۆت چاك بکەمەوە."

شێر ڕۆشتە لانەکەی خۆیو پاش ماوەیەك بە سەعاتێکی چاکراوەوە گەڕایەوە، ڕێوی سەرسام بوو، شێر دوبارە لە بەر خۆرەتاوەکە لێی ڕاکشایەوە، پاش کەمێك گورگێك هاتو کەمێك لە شێر وردبویەوە.

گورگ: "دەتوانم ئەمشەو لای تۆ سەیری تەلەفزیۆن بکەم؟ تەلەفزیۆنەکەی خۆم خراپ بووە.

شێر: "بێنە، من دەتوانم بەئاسانی بۆت چاك بکەمەوە."

گورگ: "من باوەڕ ناکەم، هەرگیز نابێت شێرێکی تەممەڵ بەو دەستە گەورانەی بتوانێ تەلەفزیۆنێك بەو ئالۆزیە چاك بکاتەوە."

شێر: "گرنگ نیە، دەتوانی تاقی بکەیتەوە؟"

شێر رۆشتە لانەکەی خۆی، پاش کەمێك بەتەلەفزیۆنی چاکراوەوە گەڕایەوە. گورك بە خۆشحاڵیەوە دور کەوتەوە، با بزانین لە لانەی شێردا چ هەواڵێك هەیە؟ لە سوچێکەوە شەش کەروێشکی زیرەكو بچوك بە چەند ئامرازێکی تایبەتەوە خەریکی کاری ئالۆز بوونو لە لایەکی دیکەشەوە

شێرێکی گەورە بە شانازیەوە پاڵی داوەتەوە!

سەرنج:

گەر دەتانەوێ بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو کاریگەر بن، لە هۆشمەندیو زرنگی کارمەندەکانتان هەراسان مەبن، بەڵکو دەرفەتی گەشە کردنیان پێ بدەن، ئەم بابەتە شتێك لە توانایی ئێوە کەم ناکاتەوە. بە وتەی بیل گیتس، بەڕێوەبەرانی سەرکەوتوو هەمیشە کەسانی لە خۆیان زیرەکتر دادەمەزرێنن.

ویلم جونز دەڵێت:

بەڕێوەبەری کارا، دەبێت راوێژکارو خاڵی گەرانەوەی کارمەندەکانی خۆی بێت، لە نێوانیاندا متمانە فراوان بکاتو تواناییو کارامەیی ئەوان ستایش بکات.

برایان تریسی دەڵێت:

بەڕێوەبەری کارا، کەسێکە کەمێك لە دەروونناسی دەزانێتو گرفتو کێشەی کارمەندەکانی لە ڕوخسارياندا دەخوێنێتەوە، هەر جۆرە گۆڕانێك بە ڕوخۆشیو ئارامیو تێگەیشتنی دروستەوە وەردەگرێت.

**هەبونی بەڕێوەبەرێکی ناکارا، لە ڕوبەرێکی کاردا**

**وەکو هەبونی مەیمونێکە لە کۆگایەکی شوشە فرۆشیدا.**

**"پەندی چینی"**

**ژیان وەکو پزیسکی ئاگرێکە لە نێوان دوو ئەبەدیەت**
**ئێمە هەرگیز شانسی دوجار دیتنیمان نیە.**

**"تۆماس کارلایل"**

ژیان
ژیان لێوان لێوە لە خرۆشان
پارچەیەك بە لەو خرۆشانە !
ژیان، تێکەڵاوی هەوڵە
بەوە دەست پێ بکە !
ژیانی هاوتای شادیە
هەستی پێ بکەو دابەشی بکە
ژیان پەیوەستە بە ئامانجەوە
هەوڵ بدە بالاترینیان مسۆگەر بکەیت !
ژیان بە دوای مەبەستێکدا دەگەڕێت
هەوڵ بدە بیدۆزیتەوە !

گەر چاوەڕوان بین تاکو هەموو شتێك
سەد لە سەد فەراهەم دێت، هەرگیز
کارێك نابێت بۆ دەسپێکردن.
"ئیوان تورگینف"

ئەگەری بێ ئامانج

مەلای مەشهور نیوە شەو لەخەو ڕاپەڕیی، ژنەکەی بێدار کردەوە پێی وت، شقارتەیەك لێدات و مۆمەکە داگیرسێنێت، ئەو بەدەنگی بەرز قسەی خۆی دوبارە دەکردەوە.

ژنەکەی مەلا وتی:

"ئێرە هێندە تاریکە، ناتوانم شقارتەکە بدۆزمەوە، ئەگەر خۆت مۆمەکە داگیرسێنیت، منیش شقارتەکە دەدۆزمەوە!"

سەرنج:

ئایا ئەم ڕستانەتان بیستووە:
ئەگەر خێزانێکی دەوڵەمەندم دەبوو،
ئەگەر بارودۆخ بەوجۆرە دەبوو،
ئەگەر لە فلانە وڵات لە دایك بومایە.

زیاتر کەسانی شکست خواردوو ئەم رستانە بەکار دێنن کە بە وشەی "ئەگەر" دەست پێ دەکەن، لە کاتێکا مسۆگەرکردنی سەرکەوتن دەبێت ئەگەرو مەگەرەکان بسڕیتەوە، بیرو ئەندێشەی ئەرێنیو جڵەوی ژیان بگریتە دەست بارودۆخی خوازراو دێنە کایەوە.

## دەبێ بە زێڕ بنوسرێ

- عاشقی باشترینەکان مەبە، باشترین بە، تاکو باشترینەکان عاشقی تۆ بن!
- بە پەند وەرگرتن لە شکستەکانی رابوردوو، پشتی شکستەکانی داهاتوو بشکێنە.
- زۆرجار دەرفەتەکان دەرگای ماڵەکانمان دەکوتن، بەڵام تاکو بێدار دەبینەوە تازە درەنگی کردووە.
- نە ترێن و نە رپلەکانی هێڵی ئاسن هیچیان راست نین، راست "جوڵە"کردنە.
- مرۆڤەکان دوو دەستەن، دەستەیەك خوایان دەوێ، دەستەیەك لە خوایان دەوێ.
- لە تێکرای هەبونەکانت کە پێیان دەنازیت، خودا جیا بکەرەوە، پاشان بزانە خاوەنی چیت؟ لە هەموو نەبونەکانیشت کە پێیانەوە دەناڵیت، خودای بۆ زیاد بکە، بزانە لە چیت کەمە؟
- دڵ بسپێرە بە دڵێك، کە شوێنێکی زۆری بە تاڵی بۆت هەبێت، دەستێك پەسەند بکە هەمیشە کراوە بێت.
- ئەو شوێنەی لێی وەستاویت ئەگەر بەدڵت نیە، بیگۆڕە، تۆ درەخت نیت!
- ئەگەر دڵ توانای بیرکردنەوەی هەبوایە، لە لێدان دەکەوت!
- کاتێ جۆری بیرکردنەوەمان دەقی گرت بە پەنیری بۆگەنەوە، تەواوی دنیا بۆگەن دەبێت.
- لە کۆڕی گەورەکاندا ڕەچاوی سێ شت بکە: بە نزمی بدوێ، کەم بخۆ،

زوو هەستە.

- ئەگەر شوشەی پەنجەرەی خۆمان خاوێن بکەینەوە، شوشەی پەنجەرەی هاوسێکانمان جوان دەردەکەوون.
- بۆ دۆزینەوەی هەڵەکانتان، ئاوێنە بەکار بێنن، نەك زەرەبین.
- خۆ کوژیی مانای ڕێچارەیەکی کاتیی بۆ کێشەیەکی هەمیشەیی.
- داستانی ژیانی تۆ، بە وشەکانی تۆ دەنوسیرێتەوە، وشەکانی تۆ نیگای تۆ دەنوسنەوە.
- ئێمە دەڵێین هەقیقەتمان خۆشدەوێ، کەچی زۆرجار ئەوەی خۆشمان دەوێ هەقیقەت نیە.
- پێ بکەنە بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی دنیا بکەیت، بزانە ڕۆژێك دنیا هێندە شەرمەزارە لە جیاتی وەڵامدانەوەی پێکەنینەکانت بە تێکرای سازەکانت سەما دەکات.
- ئەم راستیەیە فەراموش مەکە: ژیان لە بووندا نیە بەڵکو لە هەبوندایە، هەبوون ئەو شتەیە پێشتر نەتبووە.
- لە دوڕیانی ژیانو ئارامیدا، هەمیشە ڕێگەی ژیان بگرە بەر، ژیان مەکە بەقوربانی ئارامی، بەڵکو ئارامی بکە بە قوربانی ژیان.
- مرۆڤ ئەو شتەیە دەبێت بێتە دنیاوە.
- "بەڵام، ئەگەر، ڕەنگە"، ئەو بەربەستانەن کەسانی سەرکەوتوو بەسەریاندا دەپەڕێنەوە.
- ئێمە سێ لەچواری بنەڕەتی وجودی خۆمان بە بەهای لەخەڵك چوون لەدەست دەدەین.
- بەهای ئێوە زیاترە لەوەی بیری لێ دەکەنەوە، تاکە گرفت ئەمەیە تا ئێستا کەس ئەم راستیەی پێ نەوتون.

بزانن، گەر بۆق بیەوێ وەك فیل دەرکەوێت، دەتەقێت.

- بەئارامی لە چاوەڕوانی زەمەندابە، هەموو شتێك لە کاتی خۆیدا ڕوو دەدات، باخەوان ئەگەر باخەکەی نوقمی ئاو بکات، درەختەکان لەوەرزی تایبەتی خۆیاندا نەبێت میوە نادەن.
- لە هاوسەرگیریدا، ئێوە نەپیاوون نە ژن، عەشقێکن لە نێوانی دوو کەسدا.
- هەندێجار هێندە سەرگەرمی سەلماندنی عەشق دەبین، کە وتنی فەراموش دەکەین.
- گەر کوپێکی بچوك بخەیتە بەر باران، بە ئەندازەی هەمان کوپ ئاو هەڵدەگریت، گەر کاسەیەکی گەورە بخەیتە بەر باران، بە هەمان ئەندازەی ئەو کاسەیە ئاو هەڵدەگریت، چ قاپێکت خستۆتە ژێر بارانی ڕەحمەتی پەروەردگار؟
- هەوڵ بدە نەبوونت وەکو هەبونت بێت!
- تەنیایی، خۆشترە لەو کۆمەڵەی کە هیچ شتێکی لێوە فێر نابیت.
- زیاتر فێربە، تا زیاتر بەدەست بێنیت.
- لە دوو ڕیانی عەشقو ئاگایی ڕۆخانەیەك هەیە ئەویش خودایە.
- سەیرە! زۆربەمان بە بێ بیانو خەمگینین، کەچی بۆ شادبوون بێ شك بیانومان دەوێ.
- تۆ بێجگە لە باوەڕی خۆت هیچ شتێکی دیکە نیت.
- کەسێك بە تەمەنێك لەگەڵ تۆ بوندا ساتێك بێت، ساتێك لەگەڵ تۆ بوندا تەمەنێك.
- هیچ گرەنتیەك نیە، سبەی زیندو بین.
- گەورەترین خاڵی لاواز کورتبینینە، دڵنیاترین ڕێگای سەرکەوتن

هەوڵدانە بۆ یەکجاری تر.

- هەرچیەکت هەیە، لەهەر شوێنێکیت، هەرچی دەتوانی ئەنجامی بدە.
- سەرچاوەی هەموو دەردو ئازارەکان لە خەیاڵی خۆتدایە.
- دوو ڕێگە بۆ تێپەڕاندنی ژیان بوونی هەیە؛ یەکەم ئەڵێی هیچ شتێك موعجیزە نیە. دووەم ئەڵێی هەموو شتێك موعجیزەیە.
- کێشەو گرفتەکان کەسانی گەورە بەرەو باڵا دەبات، کەسانی بچوك بچوکتر دەکاتەوە.
- بە قبوڵ کردنی گەوجێتی خۆت دانا دەبیت، بە قبولکردنی ناشیرینی جوان دەبیت.
- رازی سەرکەوتن، ئەنجامدانی ئەو شتانە نیە خۆشمان دەوێن، خۆشویستنی ئەو شتانەیە ئەنجامیان دەدەین.
- لە کاتی تورەبووندا هیچ بڕیارێك مەدە.
- تاکە شتێك لەکاتی مردن دەیبەین لەگەڵ خۆمان، ئەو شتانەیە کە بەخشیومانە.
- مرۆڤ سەد ساڵ ناژی، کەچی خەمی هەزار ساڵ دەخوات.
- بەختەوەری بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێت، دەرفەتی بیرکردنەوەی نەبێت لە بەدبەختی.
- بەرگە گرتنی شتە خەیاڵیەکان سەختترە لە بەرگە گرتنی شتە راستیەکان.
- هەموو حەز دەکەن بچنە بەهەشتەوە، کەچی هیچ کەسێك ئامادەی مردن نیە.
- کاتێ ئێوە نزا دەکەن، پەروەردگار کارێك دەکات لە ئێوە ناوەشێتەوە.
- کەسانی لاواز چاوەڕوانی ڕودانی پەرجویەکن، کەسانی مەزن پەرجوو

دەخولقێنن.

- نەفامی سێ جۆرە: یەکەم، مرۆڤ هیچ نەزانێت، دووەم ئەوەی پێویستە نایزانێت، سێیەم ئەوەی نابێت بیزانێت، دەیزانێت.
- دوژمنی راستەقینە لە ناخی خۆتدایە.
- ئەوەی دەمانەوێ نیمانە، ئەوەی هەمانە نامانەوێ، ئەوەی خۆشمان دەوێ نیمانە، ئەوەی هەمانە خۆشمان ناوێ، سەیرە هێشتا هیواداری رۆژێکی روناکین.
- ئەگەر بەدوای ژیانێکی باشتردا دەگەڕێیت، پێش هەموو شتێك دەبێ ببیتە مرۆڤێکی باشتر.
- بۆ گۆڕینی ژیان، دەبێت سەرەتا، چۆنێتی بیرو ئەندێشەکانت بگۆڕیت.
- ژیان واتا، هەموو رۆژو هەموو سەعاتێك ژیان کردن.
- ئەگەر کەسێك تۆی بەوجۆرەی خۆت دەتەوێ خۆشنەویست، مانای ئەوە نیە تۆی بەوپەڕی وجودەوە خۆشناوێ.
- پێویست ناکات کەسێکی مەزن بیت، مرۆڤبوون ئەو پەڕی مەزنایەتیە.
- گرنگترین خاڵ ئەمەیە: لەهەر ساتێکدا بتوانین هەرچیەك بین بیکەینە قوربانی ئەوەی دەمانەوێ ببین.
- ئەگەر خوازیاری وەرگرتنیت، ببەخشە.
- بە شکست خواردن، ناگەیتە کۆتایی، کاتێ دەگەیتە کۆتایی تەسلیم ببیت.
- ژمارەی ئەو کەسانەی لە کارەکانیاندا شکست دەخۆن، لەگەڵ ئەو کەسانەی کارەکانیان نیوە ناچڵ رەها دەکەن، پەیوەندیەکی راستەخۆ

هەیە.

- دەبێت لە عەشقدا بمریت، تاکو سەر لەنوێ لەدایك ببیتەوە.
- تەنها کاتێ دەتوانن کاری مەزن ئەنجام بدەن، متمانەی تەواوتان بە هێزی دەروونتان هەبێت.
- باشترین ڕێگەی ناسین و لەناو بردنی دوژمنێك ئەمەیە کە خۆت بە دۆستی ئەو بزانیت.
- زیندو بوون جوڵەیەکی ئاسۆییە، لە بێشکەوە تا گۆڕ، ژیانکردن جوڵەیەکی ستونیە، لە زەویەوە تا ئاسمان بە ستونی جوڵە بکە!
- بە سوێترین ئازاری ئێمە ئەو ئازارەیە لە نەگۆڕانی خۆماندا دەیچێژین.
- بچوك و عاشق بە، عەشق یاسای گەورەبونت فێر دەکات.
- ئەگەر ڕۆژێك هەستت کرد، لە یەك کاتدا عاشقی دوو کەسیت، دووەمیان هەڵبژێرە، چونکە ئەگەر بەراستی عاشقی یەکەمیان بویتایە گرفتاری عەشقی دووەمیان نەدەبویت.
- دەنگی کردارەکانتان لە دەنگی هاوارەکانتان بەرزترە.
- بۆ هەر شوێنێك دەڕۆیت بەوپەڕی وجودی خۆتەوە بڕۆ.
- بڕیار بدە "مامۆستای گۆڕان" بیت، نەك "قوربانی تەقدیر".
- بەدوای دڵێکی جواندا بگەڕێ، نەك روخسارێکی جوان، چونکە هەرچیەك جوانە هەمیشە نامێنێتەوە، بەڵام هەرچیەك باشە، هەمیشە جوانە.
- شکست خواردوەکان دوو دەستەن: ئەوانەی بیریان کردۆتەوە بەڵام کرداریان پێ نەکردووە، ئەوانەی کرداریان کردووەو بەڵام پێشتر بیریان نەکردۆتەوە.

- ئەگەر ڕێگەیەکی بێ بەربەستت بینی، بزانە ئەو ڕێگەیە ناگاتە مەنزڵ.
- خەونەکانیش ڕاستین، چونکە ئەوەی بەڕاستی دەزانین زیاتر لەخەونێك نین.
- ترسان لە هەڵە کردن، گەورەترین هەڵەیە.
- یەك ئەمڕۆ، نرخی دوو سبەی هەیە.
- عەشقی هەقیقی ئەمەیە، هەرچیت لە سەردا هەیە داینێیت، هەرچیت لەدەستدایە بیدەیت، هەرچیەکیشت بەسەردا دێت خۆتی لێ نەدزیتەوە.
- بۆ دۆزینەوەی ئەڵماس، زەویەکانی خۆتان بکۆڵنەوە.
- گرفتەکانی دنیا، وەکو سەگ وایە، گەر لێیان ڕابکەین شوێنمان دەکەوون، گەر هێرشیان بۆ ببەین لێمان دور دەکەونەوە.
- مرۆڤ ئەگەر هەژار بێت، باشترە لەوەی بێ سۆزو خۆشەویستی بێت.
- چاوەکانتان بکەنەوە، لەهەموو جوانیانەی لەدەوروبەرتان هەیە ورد ببنەوە، تەنانەت لە سەخترین‌و ناخۆشترین دۆخەکانی ژیاندا هێشتا گەلێ شت هەیە سوپاسیان بکەن.
- هەقیقەت ناتوانرێ وەر بگێڕرێت! هەقیقەت دەبێ ئەزمون بکرێ.
- ئاسانترین ڕێگەی دەربڕینی عەشق، درکاندنە.
- کەسێکت خۆش بوێت بیرکردنەوەت فێر بکات، نەك بیرکردنەوەکان.
- بزانن کتێب پەیژەی نورە، بۆ پەروزای ئێوە بەرەو سەر زەمینی ڕوناکی، ئاگایی، دانایی، نەك ڕازاندنەوەی کتێبخانە.
- هەمیشە بە هێواشی بیر بکەرەوە، بەخێرایی کار بکە.
- ئەگەر عیلەتی نادانی خۆت نەزانی، ئەو کاتە دانایت.

- هەوڵبدە لە ژیاندا لەگەڵ نەریتی باودا بیت.
- جوانترین ساتێك كەسێك پێت ببەخشێت ئەمەیە بتوانێ خەمگینترین ساتەكانت لێ وەربگرێت.
- پێشتر نەخشەی ئایندە بكێشن، كاتێ نوح خەریكی دروستكردنی كەشتی بوو، هیچ شوێنەوارێكی بارین لە ئارادا نەبوو.
- هیچ كاتێك لە خۆت بایی مەبە، گەڵاكان هەمیشە كاتێ هەڵدەوەرێن وا دەزانن بونەتە ئاڵتون.
- دڵ تاكە ئەندامێكی جەستەیە كە بە نیگا دەستی لێ دەدەرێت.
- هەموو رۆژێك هەزاران سێو لەدار بەر دەبنەوە، بەڵام ئەوەی بوونی نیە دیدگای نیوتنە!
- عومرێك بە مەرگی تۆ كۆتایی بێت، بەهیچ شتێك قەرەبوی ناكرێتەوە.
- ئومێدی هیچ موعجیزەیەك لە مردو ناكرێت، زیندوبە.
- گەورەترین هەڵەی مرۆڤەكان ئەمەیە، ئەو كارەی حەزی لێناكەن بەو كارە بژێوی پەیدا بكەن.
- بۆ ئەوەی گەورە بیت، سەرەتا بچوك بە.
- گۆڕانی تۆ هۆكاری سەرەكی گۆڕانی دۆخەكان دەبێت.
- هەندێجار ئەوە بێننە بەرچاوی خۆتان كە بەشداری مەراسیمی ناشتنی خۆتان دەكەن.
- زۆربەی خەڵكی لە بیستو پێنج ساڵیدا دەمرن، بەڵام تا هەفتاو پێنج ساڵیی دفن ناكرێن.
- هەڵە كردن، كێشە نیە، بەو مەرجەی لە بیری نەكەیت.
- هەندێجار هێندە نیگەرانی گەیشتنین، گرنگترین شت لە بیر دەكەین،

ئەویش جوڵەو هەنگاو هەڵگرتنە.

- پەرواز بکە بەو شێوەیەی خۆت دەتەوێ، ئەگینا پەروازت پێ دەکەن بەو شێوەیەی کە دەیانەوێ.
- بیرکردنەوە بە بێ هەوڵ، هیچ بەهایەکی نیە.
- سەیر نیە، ئێمە بەدەستێکمان گرفتەکان دەسازێنین، بەدەستێکی دیکەمان لەناویان ببەین.
- کاتێك لەسەر زەوی کەسێك نیە بیری لێ بکەیتەوە، بیر لە ئاسمان بکەرەوە، چونکە لە ئاسماندا کەسێك هەیە بیرت لێ دەکاتەوە.
- هەرگیز ئاستەنگەکان بە گەورە مەزانن، بە خۆتان بڵێن، ئەم ئاستەنگانە گەورەن یان خودا؟
- بۆ سەرکەوتن، ئەوەی لەئەنجامدانیان دەترسن، ئەنجامی بدەن.
- ئەو کەسەی خاوەنی سەروەت و سامان نیە، خاوەنی خۆیەتی.
- لەو کەسە بترسە شتێکی نیە بۆ لەدەستدان.
- هەندێجار ئەوەی دەتانەوێ و مسۆگەری ناکەن، جۆرە شانسێکە.
- هەمیشە قسەیەك بکەن بتوانن بینوسن، شتێك بنوسن بتوانن واژۆی بکەن، شتێك واژۆیەك بکەن بتوانن خاوەنی بن.
- هیچ شتێکی بە قیمەت، خێراو ئاسان ڕونادات.
- ئەو شوێنەی شایستەی ئەوەیە بۆی بڕۆن، ڕێگەیەکی ناوقەد بڕی نیە.
- لە بەرامبەر ویستی خوداوەندا وەکو منالی یەك سالە بن، کاتێ هەڵدەدرێت بە هەوادا پێدەکەنێ، چونکە باوەڕی بەوە هەیە دەیگرنەوە.
- بزانن، گەشبین نورێك کە وجودی نیە دەیبینێت.
- بزانن: لە نێو کۆمەڵێکدا دامەنیشە وەستابن، مەوەستە ئەوان

دانیشـتبێتن، مـەگری ئـەوان لـە پێکەنینـدا بـن، پـێ مەکەنـە، ئـەوان لـە گریاندا بن.

- هەرگیز لەوتنی خۆشم دەوێی ماندو مەبن.
- پـێش هاوسـەرگیریی چـاوەکانت تـەواو بکـەرەوە، دوای هاوسـەرگیریی کەمێك چاوەکانت دابخە.
- تێکرای ئەوەی دەبێ لە ژیاندا فێری بیت یەك وشەیە "تێدەپەڕێت".
- گـرنگ ئەمـە نیـە خـاوەنی چـیت، گـرنگ ئەمەیـە چـۆن سـوود لـە هەبونەکانت وەردەگریت.
- کاتێ لەگەڵ منالاًندا گەمەو یاری دەکەن، لێگەڕێ، با ئەوان براوە بن.
- فـرین، بـاوەڕی باڵندەیەکـە بـیر لـە فـڕین دەکاتـەوە، ئەگـەرنا بیـانوی فڕین پەڕو باڵ نیە.
- ژیان دوو ڕوو زیاتری نیە، یان گاڵتـەت پـێ دەکـات، یـان تـۆ گاڵتـە بـەو دەکەیت. تۆ سەرپشکیت.
- هەرچی جارێك ڕو بدات، ڕەنگە هـەرگیز ڕوو نەداتـەوە، بـەڵام ئـەوەی دوجار ڕوبدات، بێگومان جاری سێیەمیش ڕوو دەداتەوە.
- ئــەوەی دەمێنێتــەو پــەرواز ناکــات، پــەی بــەڕازێکی گــەورە بــردووە، ئەویش فەلسەفەی پەرواز کردنە.
- یەکەم هەنگاو لە ڕێی دانایی، پەی بردنە بە نەفامی.
- سەیری ئەوە مەکەن کە دەڵێت، بزانن چی دەڵێت.
- زیندوو بوون واتا دوبارەو دوبارە هاتنە دنیا.
- زیاتر لە جیاتی ژیان، لەئارەزوی ژیانکردندا دەمرین.
- لە ژیاندا ئەگەر وەکو کلیل ڕەفتار نەکەیت، دەبیت بە قوفڵ.
- تەنها خۆت دەزانیت، چ شتێك بۆ تۆ باشترینە.

- هەقیقەت هەمیشە لەو شوێنەیە کە ئیمانی لێیە.
- لە دەستدانی هەندێ شت، باشترە لە لەدەستدانی هەموو شتەکان.
- کەسی ژیر ئەو کەسەیە لەم دنیایەدا دەژی، بەڵام پەیوەست نیەوە پێوەی.
- ژیان دیاریەکی ئامادەکراو نیە، تۆ میراتگری هەمان ئەو ژیانەیت کە بۆ خۆت دروستت کردوە.
- خێراترین ڕەوشی سەرکەوتن ئەمەیە بەجۆرێ بژیت وەکو خەریکی یاریەك بیت.
- گەر دەتەوێ هەمیشە شادو دڵخۆش بیت، لەهەموو شتێك وا بڕوانە کە دواین جاری بینیت بێت.
- ئەوە بڕیارەکانی تۆیە چارەنوس دیاری دەکات، نەك بەختو ئیقباڵ.
- هەرکەسەو سازی خۆی دەژەنێت، بەڵام گرنگ خودی تۆیە بەسازی هەموو کەسێك سەما نەکەیت.
- دلێریی، واتا بترسە، بلەرزە، بەڵام هەنگاوێك هەڵگرە.
- دوو وانەی سەرکەوتن لە بیر مەکە: یەکەم، بوێریی دەربڕینی بیروڕا، دووەم، بوێری قبوڵکردنی هەڵە.
- بەو جۆرە بە، بتوانی بەهەموان بڵێیت وەکو "من" بە.
- ئەوە تۆیت خێرایی تێپەڕینی زەمەن دیاری دەکەیت.
- سەیرە هەموو دەیانەوێ کەسی گرنگ بن، هیچ کەس نایەوێ کەسی بەسوود بێت.
- ژیان گرێیەك نیە بەدوای کردنەوەیدا بگەڕێین، بەڵکو راستیەکە دەبێت ئەزمونی بکەین.
- هیچ کاتێ شك لە باوەڕەکانت مەکە، باوەڕت بە گومانەکانت نەبێت.

- ڕابــردوو لــه بــیر بکــەن، هــەرگیز هــەوڵ مــەدەن، خــۆڵی بێــژراوە ببێژنەوە.
- تاکو شتێکی جیاواز نـەبینیت ، نـاتوانی کـارێکی سـەرکەوتوانە ئـەنجام بدەیت.
- کەسی بەدبین لەهەر دەرفەرتێك گرفتاریی دەبینێت، کەسـی گەشبین لە هەر گرفتارییەك دەرفەتێك.
- دەزانین خۆمان چین، بەڵام نازانین دەتوانین ببین بەچی؟
- بۆ گەیشتن بە کامەرانی، هەمیشە هیوای باشـترینت هـەبێت، ئامـادەی خراپترینیش بە.
- هەبوونی ئامانج گرنگ نیە، پێکانی ئامانجەکە گرنگە.
- بـۆ بەخشـینی کەسـانیتر، دەبێـت سـەرەتا خـۆت ببەخشـیتو لۆمـەی خۆت نەکەیت، ئەمەش سەرەکیترین خواستی منداڵەکەی ناخی خۆتە.
- لەکەسانیتر ببورە، نەك لەبەر ئەوەی ئەوان شایستەی لێبـوردنی تـۆن، بەڵکو لەبەر ئەوەی تۆ شایتەی ئەوەیت ئارامیت هەبێت.
- بەختـەوەریمان لـەم سێ شـتەدایە: ئـەزمونی دوێنـێ، سـوود وەرگـرتن لەئـەمڕۆ، هیـوا بـە سـبەی، بـەڵام بـەم سـێ شـتە خۆمـان وێـران دەکـەین: حەسرەتی دوێنێ، بەفیرۆدانی ئەمڕۆ، ترس لە سبەی..

کۆتایی